چاپی یەکەم
2010

سایە





پۆل ستراتێرن

وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

# ساتێک لەگەڵ هیگڵ

زنجیرەی ناسینی فەیلەسوفەکان

٥

# ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی

# سایە

ناوەنیشان: سلێمانی – سابونکەران – تەنیشت شوقەکانی تەکیە رووتە

٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤ - ٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣

پۆڵ ستراتێرن

# ساتێك لەگەڵ هیگڵ

وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

چاپی یەکەم

٢٠١٠

سلێمانی

# ساتێک لەگەڵ هیگڵ

ناسنامەی کتێب:

ناوی کتێب: ساتێك لەگەڵ هیگڵ

نوسینی: پۆڵستراتێرن

وەرگێڕانی بۆ فارسی: مەسعود عولیا

وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی ئەکبەر مەجیدی
Shawi_hewr@yahoo.com

دیزاین: ناوەندی سایـــــــە

تایپ: ئانیتا

شوێنی چاپ: چاپەمەنی سایە

ساڵی چاپ: چاپی یەکەم زستانی ٢٠١٠

تەژمار: ١٠٠٠

نـــرخ:٢٠٠٠

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ( ١٨٨٨ ) ی ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێ دراوە.

## پێڕست

بابەت ـــــــــــــــــــــــــ لاپەڕە

# پێشەکی

لە ساڵی (١٧٧٠)ی ز ئەو ساڵەی کە هیگڵ لە دایك بوو، کانت بیرۆکەکەی بۆ دەسپێکی مامۆستایەتی لە زانکۆی کونیگسبێرگ خستەڕوو. لە هەمان ساڵدا "هوڵدەرلین"ی هۆنراوەبێژ و "وردزورس"ی هۆنراوەبێژ لە دایك بوون. توێی شێوازی سەرسوڕهێنەری سیستماتیك‌و پڕاوپڕ لە سەر بنەمای عەقڵ — ئەوپەڕی وێناکردن‌و ئەوپەڕی بینین- چێنران. ئەوروپا بەرەو گەورەترین گۆڕان ڕۆیشت کە لە سەردەمی نوێبوونەوە (ڕێنسانس) بەملاوە دانرا. شۆڕشی فەرەنسا روخسارێکی سیاسی ئەم ئاڵوگۆڕ و بزووتنەوە رومانتیزمە بووە سومبولی ڕۆشبیرییەکەی.

لەم نێوانەدا شۆڕشی پیشەسازی بووە هۆی گۆڕانی سەرانسەری لە ئەوروپادا، چەندین ساڵ پاش مەرگی هیگڵ، مارکس بۆ دابینکردنی ئاڵوگۆڕێکی تر ژیانی بە سەر دەبرد، ئەو ئالوگۆڕەی کە روخساری سەدەی بیستەمی گۆڕی.

هیگڵ بەرامبەر بە هەر دووی ئەم ئاڵوگۆڕانە ڕێزێکی تایبەتی دادەنا. هگێل- ی خوێندکار بەرەو پیری سەربەخۆیی فەرەنسا چوو، ئەو سروودانەی وت کە بۆ ستایشی دەوڵەتی پرۆس - ئەوەش دەوڵەتێکی زۆر موحافیزەکار بوو. ئەم ئالوگۆڕە بنەڕەتیە لە روانگەی هیگڵ- ەوە لە ریزی ئەو بیروباوەڕانەدایە کە تەنها لە چوارچێوەی شێوازی دیالێکتیکە بەناوبانگەکەی دەگونجێت.

شـێوازی دیالێکتیـك لـه دەسـتی هـیگڵ دا ناشـیرین تـرینو بـێ چوارچێوەترین سیستمی فەلسەفی بوو کە مرۆڤ لە سەر گۆی زەوی بە دوایـدا دەگـەڕا، دایمەزرانـد: ئـەوەش سیـستمێکی یەکپارچـە بـوو بـۆ ستایـشی دەوڵـەتی یەکپارچـە، بـەلام شـێوازی هـیگڵ کاتێـك لـە لایـەن لاینگرەکەیـەوە – مـارکس- پێـشوازی لێکـرا، گـەورەترین شۆڕشـی پـاش شۆڕشـی فەرەنـسا سـازدا. بەداواچـوونی سیـستمی دیـالێکتیکی هـیگڵ لانیکـەم واتـای وابـوو: رەنگـە خـودی هـیگڵ تـا ئـەم رادەیـە وای بـۆ نەدەچوو کە ئەوەندە بە دوای سیستمەکەی دا بڕۆن.

***ژیانو بەرهەمەکانی هیگڵ:***

"ئەوپەڕی ئازایەتی بۆ ئەو قسانەی کە تا ئێستا فەیلەسوفەکانی تر نەیانوتبوو، دەرەنجام هیگڵ وتیو ئەوانەش تا ئەودەم وەك نهێنیەکی پرسیارو نهێنیی فەلسەفە وابوون. ئەو شتەی کە بە ـی ئەو کەسانەی کە هێشتا لە دایك نەبوون وەك دۆخێکی ئەفسانەئاسا وابوو. وەك نموونەیەکی بەرجەستەی کەللەڕەقو ئازایەتی ئەڵمانی خرایەڕوو و مایەوە. " شۆپێنهاوێر"ی هاوڕێی هیگڵ لە زانکۆی بەرلین بەمجۆرەی نووسی. مەبەست لەم قسەو باسانە ئەمەیە کە ئێمە بە شێوازێکی تر هیگڵ لێکبدەینەوە بەڵکو ئاگادارکردنەوەیەکی تەواوە. فەلسەفە لە لای هیگڵ دەبێتە دۆخێکی زۆر جدی. بۆیە باشتر وایە لە سەرەتای کارکردن هەرجۆرە گاڵتەو کەپێك بەلاوەبنین. بەوجۆرەی کە کابرایەکی مەلائاسای بەریتانی کە زۆر ژیانی بە قورسی گرتبوو و خەڵکی هاندەدا کارێك بکەن لە ئاگری جەهەنەم بە دوور بن، کە لەو شوێنەش کۆمەڵە کەسێکی مۆدێل گەراو سەرخۆش راوەستابوونو دەم بە پێکەنین — ناوچەیەك بوو لە ئەڵمانیا بە ناوی — باس-، دەیوت:

"ئـەو کەسـانەی کـە پێدەگـەنن هـیچ ئومیـدێك چـاوەڕێیان ناکـات. "هەڵبـەت ئەمـە قـسەی کەسـێکە کـە هـەموو شـتەکان بـە قورسـی وەردەگرێت. ڕاستیەکەی ئەوەیە بە لای هگێڵەوە فەلسەفە زۆر دژوارە و فێربوونی پێویستی بە زیاترین ئاستی وردبینیو تەرکیزی هۆشە. بۆیـە وادیـارە گوایـە شـۆپێنهاوێر سـەرەڕای توانـایی عـەقڵی کـە زۆر وردبینو شیکار بوو بە ڕادەی پێویست هەوڵی نەداوە بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی هیگڵ. لە لایەکی تر تەنانەت خودی هیگڵ دانی بەوە داناوە "تـەنها یـەك کـەس لـە قـسەکانم تێـدەگاتو تەنانـەت ئـەوەش لێـی تێناگـات"، ڕێژەیـەك لـە ڕەختـەگرەکان دەڵـێن هـیگڵ لـەم قـسەیەدا زێدەڕۆیی دەکرد، بـەڵام ئایا لـە ڕاستیدا کەسێکی وا تا ئێستا بوونی هەبووە؟

"گیـۆرك ویلـهێلم فیـدریك هـیگڵ" لـە بـەرواری (٢٧)ی جـۆنی سـاڵی (١٧٧٠)ی ز لــە شــاری "ئەشــتۆتگارت"ی ئــەڵمانیا لــە دایــك بــوو. بنەماڵەکەی جیل بە دوای جیل فەرمانبەری حکوومی بوونو باوکی لە دایـرەی بـاجی وێتـەرمبێرگ کـاری دەکـرد. هـیگڵ لـە ئاراسـتەی ئـەو کۆمەڵگەیە کە تیایـدا پـەروەردە ببـوو بـە زاراوەی تـۆخی "سوابیا"یـی قسەی دەکردو ئەم زاراوەیە تا کۆتایی تەمەنی لە قسەکانیدا دیار بوو. تـا کۆتـایی تەمـەنی بـڕوای وابـوو کـە خـۆ بەزلنـەزانی یـەکێ لـە تایبەتمەندییە باشە بنەڕەتیەکانی پەروەردەی مرۆڤە.

هیگڵ لـە منـداڵی دا تووشی نەخۆشی جۆراوجـۆر ببـوو، پـێش ئـەوەی تەمەنی بگاتە گەورەساڵی چـەندین جار تووشـی نەخۆشـی مەترسـیدار

ببوو. لە تەمەنی شەش ساڵان دا تووشی نەخۆشی ئاوڵە بوو. ئەم نەخۆشییە بەلایەوە ئەوەندە دژوار و سەخت بوو کە وای لێهات گیانی لە دەست بدات. بۆ ماوەی زیاتر لە هەفتەیەك هیگڵ بینایی لە دەست دا و لەوە بە دواوە بە شێوەیەکی ناخۆش روخساری شڵ بوو. لە تەمەنی یانزە ساڵان دا (تا)یەکی گشتگیر بنەماڵەکەیی گرتەوەو هەر ئەو تا- یە دایکی لێسەندو بە تەنها مایەوە، بەلام خۆی نەخۆشیەکەی لە کۆڵ بووەوە. لە کاتی خوێندنی دا بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشی "مالاریا" چەند مانگ لە ناو جێدا کەوت.

هیگڵ کە بەرەو تەمەنی لاوێتی دەڕۆیشت هەموو جۆرە بابەتێکی دەخوێندەوە، بەرهەمی ئەدەبی، رۆژنامەکان‌و ئەو نامیلکانەی کە بە دەستی دەگەیشت‌و لە هەموو بوارێکەوە دەیخوێندەوە. سەرەڕای ئەوەش لە سەرەتای ژیانیدا بڕوای بە روانگەی سیستماتیك‌و وردبینی هەبوو و بە وردییەکی زۆر چەند پارچەیەکی هەڵبژێردراوی لە هەر نووسینێك کە دەیخوێندەوە لە نامیلکەی یاداشتی رۆژانەیدا دەینووسیەوە. ئەم پەروەردە وردە بە شێوازێك لە باردی هەموو مەسەلەکانەوە بوو: لە روخسارناسی بگرە هەتا فەلسەفە، لە جەمسەری باکوورو باشوور بگرە تا خۆ بە نەخۆش زانین. مەسەلەی شەخسی‌و تایبەت تەنها کاتێك دەگۆڕا بۆ دۆخی نووسین کە دەربڕ و دەست نیشانکەری بنەمایەکی ئامانجگەراو تەواو ببوایە. هیگڵ لەو رۆژانەدا کە شتێکی زۆر گرنگ‌و بەرچاوی بۆ تۆمارکردن لە نامیلکەکەیدا نەدەبینی، مەسەلەی نووسینی بە گرنگ دادەنا تا بنووسێت، چونکە دۆخێکی نائومێدی

روویداوبوو. خوێنەران کە زۆر حەز دەکەن لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەم فەیلەسوفە بکەن‌و بزانن چی لە ناو مێشکە فکریەکەی هیگڵ دا هەیە، ئەگەری هەیە لەم یاداشتانەدا لە پاڵ راپۆرتێك وەك ئاگرکوژێنەوەی گەڕەك لەگەڵ رەخنەگرتن لە کۆنسێرتێك کە هیگڵ لەوێ بەشداریی کردووە، رووبەڕوو ببنەوەو لە دواییدا لەگەڵ لێکدانەوەو شیکردنەوە لەبارەی هەوای سارد، یان نامەیەکی کورتکراوە سەبارەت بە بەهایەك کە لە نامیلکەی وشە بیانیەکاندا کە لەم دواییانەدا بە دیاری وەریگرتبوو، دەست نیشان بکرێت. یەکێك لە خوێنەرە لێکۆڵەرەکان دەنووسێت: "هیگڵ نامەیەك بە زمانی بیانی رێکدەخات، بۆ رەتکردنەوەی نووسینی بابەتێك بە زمانی ئەڵمانی بۆ وەرگێڕەکەی بۆ سەر خەتی بیانی رای دەردەبڕێت، بەرنامە فێرکاریەکەی لە پەراوێزدا یاداشت دەکات‌و دەڵێت: ئەو و هاورێکانی لە قیافەتی کچە جوانەکان دا چاوباشقی دەکەن، لەبارەی "ویرژێل"و "دموستنێس" هەندێ شت یاداشت دەکات، حەزی لە کاتژمێرێکە کە زەنگ لێبدات، ئارەزووی لە ئەنێسکلۆپیدیای ئەستێرەکانە، هەروەها رۆژانی یەکشەممە بیرکاری لە سەر مەسەلە سێگۆشەکان دەخوێنێت."

ناکرێ بە ئاسانی لە سەر گرنگی "کارگەی بەشە هەڵبژاردەکان" وەك وێنەیەك کە هەم چەماوەیەکە بۆ زانیاریی تایبەت‌و هەم دەرخەری چەقبەستوویی کەسایەتی لەناکاوێکە، جەختێکی زۆری لە سەر کردەوە. لەو کتێبە ئەستورانەی کە دوایی هیگڵ نووسی، ئاماژە بە هەندێ سەرچاوەی شکۆدار دەکات کە تا رادەیەك لە دەرەوەی توانای

مرۆڤدایە. وەك ئەو راستیانە کە زۆرجار لەم سەرچاوانەدا هەندێ هەڵەی ورد دەبینرێت، تەنها ئەنێسکلۆپیدیایەك زدینی هیگڵ سەقامگیر دەکات. ئەم سەرچاوانە بە بەردەوامی لە زەینەوە گواستراونەتەوە، هیگڵ حەزی نەبوو کە زنجیرەی بیرکردنەوەکانی بە هۆی روانینی بە سەر سەرچاوە، یان پیاچوونەوەی قسە گێڕاوەکان بپچرێت.

بە وتەی "کرەد"، یەکەمین ژیاننامەی هیگڵ وابووە کە باوکی کەسێکی چەقبەستوو بە بەرنامەکانیو ئاردزووە پارێزراوەکانی کە بە گوێرەی پیشەکەی ئاسایی بوو کە ئەم فەرمانبەرە لە ئیدارەی باجی گەرەکیدا، باوکیی رەوشت وشك بووە کە کەسایەتییەك درەنگ ـەناسرا. لەم رۆژانەدا نزیکترینو هاوڕێترین کەس لە هیگڵ ـەوە، کریستن ـی خوشکی بوو کە سێ ساڵ لە هیگڵ بچوکتر بوو. ئەم خوشكو برایە کە دایکیان مردبوو، زۆر گرێدراوی یەك بوون. بنەمای ئامانجگەرا کە هیگڵ لەم دۆخە مرۆڤانە دەگمەنەی هێنایە دەر، ئەمە بوو کە خۆشەویستیی برا و خوشکی، والاترین نموونەی خۆشەویستیە. لە ساڵانی دوایی لە فەلسەفەکەیدا ئەم کارەی لە سەر بەڵگەی نمایشنامەی "ئانتیگۆنە" بەرهەمی "سوفوکێڵ" پیشان دا: لەم نمایشنامەیەدا "ئانتیگۆنە" وەك ئەرکناسی بۆ ناشتنی تەرمی براکەی ئامادە دەبێت مردن پەسەند بکاتو پاشان خۆی دەکوژێت، واتە کارێك کە خۆی خۆکوشتنێکی ترو قەیرانێکی تری لێدەکەوێتەوە. وەك دەبینین، دۆخی وروژێنەری ئەم تراژیدیا یۆنانیە، راستیەکانی نێوان

دەروونناسی شاراوە لەگەڵ پەیوەندیی نێوان هیگڵو خوشکەکەیدا پەرج دەداتەوە. "کریستین"ی هەستیار، نوقمی هەموو شتێکی برا زۆرزانەکەی خۆی بوو، خۆشەویستیەکەی بەرامبەر بە هیگڵ گۆڕا بۆ پەیوەندییەکی سەقامگیرو ناسروشتی کە دەرەنجامی قەیراناوی لێکەوتەوە.

هیگڵ لە تەمەنی (١٨)ساڵی لە قوتابخانەی ئیلاهیاتی زانکۆی توبینگەن ناوی خۆی تۆمار کرد. سەرەڕای ئەوەش تایبەتمەندییەکی تەواوی یەك فەرمانبەری حکومی لە خۆی دەردەخست، باوكو دایکی پێیان خۆش بوو منداڵەکەیان بڕواتە ناو سیستمی ئاینی مەسیحیەت. ئارەزووەکانی هیگڵ پێشتر لە دۆخی زۆر فراوانتر لە ئایندا دەسوڕایەوە. سەردڕای ئەمەش بۆ یەکەم جار کە هیگڵ لە ناخو دڵەوە گرێدراوی فەلسەفە بوو، کاتێك بوو کە چووە ئەم زانکۆیە. هەر ئەم گرێدراویەش بوو کە توانی دوو کەسی بلیمەتی سەردەمی خۆی لە (توبینگەن)دا بناسێت. یەکێك لەوانە "هولدەرلین" بوو: شەیدای بەگڕوتینی کلتوری یۆنانی کە دوایی چووە ریزی ناودارترین هۆنراوەبێژانی زمانی ئەڵمانی. ئەویتریان (شلینگ) بوو کە فەلسەفەی سروشتی خۆی رۆمانسی بوو، بووە پێشەنگی کاردانەوەی سەدەی نۆزدەهەم لە بەرامبەر بەربەستو رێسا کاتیەکانی ژیرگەرایی یان لۆژیك گەرایی. ئەوەندەی نەخایاند کە لەم کۆڕە خۆشو شادومانەدا، هیگڵ بووە کەسێکی شۆڕشی بە دۆخێکی رۆمانسیەوە. کاتێك ئاگری

شۆڕشی فەرەنسا داگیرسا، لەگەڵ (شلینگ)دا کازیوەی بەرەبەیان لە خەو راچڵەکین تا (داری ئازادی) لە شەقامەکاندا بنێژن.

هیگڵ بە تەواوی ئارەزووی چووە سەر کلتوّری یۆنانی دێرین و فەلسەفە نوێیەکەی "کانت". کتێبە فەلسەفیەکەی کانتی بە گەورەترین شاکاری مێژووی فەلسەفی ئەڵمانیا زانی و بەمجۆرە رێزی لێگرت کە ناوی کتێبەکەش ئەمە بوو: "رەخنەی ژیرانەی رەسەن" یان "رەخنەی لۆژیکی تەواو" کە حەوت ساڵ پێشتر واتە لە ساڵی (١٧٨١)ی ز لە چاپ درابوو.

لەبەر ئەوەی بزانین بۆچی (کانت) تا ئەم رادەیە گرنگیی هەبوو، پێویستە گەلاڵەی گشتیی رابوردەی فدسەفەی پێش کانت بە دەست بێنین. لە نێوەی سەدەی هەژدەهەمدا، (هیوّم) فەیلەسوفی سکۆتلەندی باوەڕی فەلسەفی تا رادەیەکی زۆر کەمی کردووەتەوە. رایگەیاند کە ئەزموون تەنها سەرچاوەی ناسینی راستیەکانمانە. فەلسەفەی ئەزموونگەرایانەی (هیوّم) جەختی لە سەر ئەگەری نەخولقاندنی هەر جۆرە سیستمی فەلسەفیی تر کردووەتەوە. بۆ بنیاتنانی هەر سیستمێك پێویستمان بە رەگەزو هەندێ بنەما هەیە وەك: سەرچاوەی هۆکار (واتە هۆکار و وەرگر)، بەڵام هیوّم پیشانی دا کە سەرچاوەی هۆکار تەنها پێشمەرجەو بەس. هیچ کەس تا ئێستا هۆکارو وەرگرێکی ئەزموون نەکردووە کە لەوە سەرچاوە وەربگرێت، هەموو ئەو شتانە کە لە راستیدا ئەزموونیان کردووە ئەوەیە کە شتێك بە دوای شتێکی تردا روویداوە. وادیارە ئەمە بە واتای کۆتاییهاتنی فەلسەفەیە.

سەرەڕای ئەمەش کانت توانی ئەم قەیرانە لە سەر ڕێگاکەی لابەرێتو بە سەریدا زاڵ ببێت، ڕایگەیاند هۆکاری سەرچاوە بە تەواوی یەکێکە لەو ڕێگایانە کە بەوانە لە جیهان تێدەگەین: وەك شوێنو زەمەن، ڕەنگو هەندێ شت لەو شێوەیە. هیوّم ڕاستی دەکرد لە جیهاندا شتێك بە ناوی هۆکاری سەرچاوە بوونی نەبوو، لە بری ئەوە هۆکاری سەرچاوە لە خۆماندایە، هۆکاری سەرچاوە شێوازی تێگەیشتنی جیهانە بە لامانەوە.

لە سەر ئەم بنەمایە "کانت" توانی بە پشت بەستن بە ژیری، سیستمێکی فەلسەفی گشتگیرو تەواو دابمەزرێنێت کە هەموو شتێکی شرۆڤە دەکرد. بە نووسینی زنجیرەیەك بەرهەمی کەمو دژوار لە واتادا، فەلسەفەکەی خۆیی بۆ خەڵکی جیهان شرۆڤە کرد. لەمڕووەوە سەردەمی میتافیزیای ئەڵمانیا، سەرەڕای هەموو بەرزەفڕیو درێژدادڕییەکەی دەستی پێکرد. هیگڵ هاتە قسە: مێشکێکی بیرمەند هاتە ئارا کە بە ئەندازەی خودی خۆی زۆرزان بوو.

هیگڵ بە گرنگیدانی وردو بەردەوام چووە ناو بیرۆکەکانی کانتو هەندێ ڕێگای بۆ خۆی کردەوە کە ئەم کارەشی بە یارمەتی کلتوری یۆنانی تەواو کرد. لەم نێوانەدا لە هەر سووچێك شتێکی دەقۆستەوە، ئنجا دەیخستە نێو "کارگەی بەشە هەڵبژێردراوەکان"ی خۆی. تەنانەت لە ساڵانی سەرەتای زانکۆیدا لە لای هاوڕێکانی بە "پیرەمێرد" ناوبانگی دەکرد. وادیار بوو ئەم نازناوەی بە هۆی کەسایەتیی وشكو

بێ رۆحی خۆیو به هۆی هۆکاری راڕایی ئاسای لە سەر خوێندنەوە وەریگرتبوو.

کاتێك هیگڵ لەساڵی (١٧٩٢)ی ز زانکۆی بە جێهێشت، بڕیاری وای نەبوو بڕواتە ناو سیستمی ئاینی مەسیحیەتەوە. ئەو شتەی ئەو دەیویست لە راستی دا پلەیەك بوو لە زانکۆدا واتە وانە وتنەوە لە زانکۆ، بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە تەنها توانی بڕوانامەیەك بە دەست بێنێت کە نمرەکەی مامناوەند بێت. باوكو دایکی تێزی زانکۆکەیان بۆ تەواو کرد، بە وردبینی دەریدەخست کە لە فەلسەفەدا خوێندکارێکی باش نەبووە.

راستی لەمەدایە خوێندنەوەکانی هیگڵ لە بواری فەلسەفەو بوارەکانی تردا تا رادەیەکی تەواو لە دەردوەی وانەکانی زانکۆی بوو، شتێك کە تایبەتمەندیی زۆربەی لە زدینو مێشکە دردوشاوانەیە کە دۆخێکی مامناوەندیان هەیە. پێی خۆش بوو بەردەوام بێت لە سەر ئەم خوێندنە مەزاجیو نارێكو پێکە.

هیگڵ بۆ بژێوی ژیانی، پیشەی مامۆستایەتی ماڵانی پەسەند کرد. ئەم پیشەیە ئەوی تا شاری "برن"ی سویسرا برد کە سێ ساڵ لەوێ مایەوە. هیگڵ لە کتێبخانەی ئەم شارەدا زۆر کتێبی دەخوێندەوەو زۆر تەنیا بوو. ئەو نهێنیەکانی دڵی خۆیی بۆ سروشت دەگێڕایەوەو بەمشێوەیە ناخی دادەمرکاند.

پەرچدانەوەی بەرامبەر بە دیمەنە ناوچەییەکانی کوێستانی ئالپ، وێنایەکی دەروونناسانەی سەیرو سەمەرە دەخولقێنێت کە چاوی هەر

بینەرێك بۆ خۆی رادەكێشێت. لەم رۆژانەدا نووسی: "من بە دوای ئەوەدام كە لە ئامێزی سروشت دا لەگەڵ خۆمو كەسانی تردا ئاشت ببمەوە. لە بەر ئەوەی زۆرجار خۆم دەخشێنمە باوەشی ئەم دایكە راستەقینەیە تا لە پێكەوەبوونماندا خۆم لە ناو خەڵكدا بناسمەوە. ئەو دایكە (سروشت) وام لێدەكات تا بە هۆی خۆیەوە زیانم بەر نەكەوێت. من لە خۆیدا بپارێزێتو هیچ دوورییەكمان لە نێواندا نەبێت." سەرەڕای ئەمانەش گۆی لوتكەی شاخە سافو لووسەكانی ئالپ لە روانگەی هیگڵ وەك "مردووی هەتاهەتایی" وابوون، لە حاڵێكدا كاتێك ئەم تاڤگەیە بەرەو پێشەوە دەبرد، بە لایەوە نموونەی ئازادیو كایەو رزگاری بوو. دەروونناسێك بە ناوی "شارفشتاین" وتوویە لوتكە ساردوسڕەكانی كوێستان "سەقامگیربوونی ئازاراوی خەمۆكی" بە بیری هیگڵ دێنێتەوە كە تاڤگە بە لایەوە هێمای "رزگاربوون"ە لەو. چ ئەم قسەیە بریتی بێت لە رۆشنبیریەكی دەروونناسانە یان بیركردنەوەیەكی بە ناچار، هیچ گومانی تێدا نیە هیگڵ لەم تەمەنەیدا خەمۆكی پەلاماری دەدا، ئەو رەنجو ئازارەی كە تا كۆتایی تەمەنی لەگەڵی بوو. ( وادیارە ئەو وێنەو نووسینانەی لە هیگڵ بەجێماوە، بەڵگەیەكە بۆ سەلماندنی ئەم دۆخە.)

هیگڵ لەم سەردەمەدا بە هۆی كاریگەری كانت لە سەر بیروباوەڕی، رێژەیەك نامەی ئاینی لە رەخنەی پۆستگەرایی یان بڕواهێنان بە سەرچاوەی مەسیحی نووسیو هەروەها كتێبێكی نووسی بە ناوی "ژیانی مەسیح" كە تیایدا "ئیسا" بە مرۆڤێك دادەنێت كە تایبەتە

بەم جیهانە. لەم بەرهەمەدا، قسەکانی ئیسا سەبارەت بە پەروەردەی مەسیحیەت زۆرجار هاوشێودییەکی سەیری لەگەڵ قاردمانەکەی هیگڵ دەدۆزێتەوە، پەروەردەی سادەو پڕ واتای مەسیح بە جۆرێك ئەرکناسی بە شێوەی فەلسەفەناسای ئاڵۆزی ئەڵمانی دێتە ئارا. کانت فەلسەفەی رەوشتی خۆی لە سەر بنەمای ئەو شتانەی پەیوەستە بە کارێکی تەواو و سەداسەد بنیاتی ناوە: "مرۆڤ دەبێ تەنها لە سەر ردوتی فەرمان (یان رێسایەك) بجووڵێتەوە کە بەو هۆیەوە لە هەمان کاتدا ئیرادە بکات کە ئەو فەرمانە ببێتە یاسایەکی جیهانگیر." ئەم قسەیە بە راشکاوی لە قسەکانی ئیسا دەردەکەوێت: "لەگەڵ کەسانی تردا وەها قسە بکە کە لەگەڵ خۆتدا دەیکەیت." هەوڵی هیگڵ بۆ ئەوەی کاست وەك نموونەیەك دابنێت. سەبارەت بە مەسیح لەمبارەیەوە کۆتایی پێهێنا: دەبێ لە سەر بنەمایەك رەفتار بکەن کە دەتوانن ئیرادە بکەن کە فەرمانێکی گشتی لە نێو خەڵکدایەو ئێوەش ئەوە دەکەنە رێسایەك بۆ خۆتان"، لێکدانەوەی هیگڵ سەبارەت بە "ئیسا"، لێکدانەوەیەکی زەمینی بوو واتە ئیسا هی ئەم جیهانە بوو، هەم لە بواری شێوە هەم لە بواری بیرۆکە، دڵ ناوەرۆکێکی بێ ورەیە کە خۆی لێی پەشیمان بووەوە. ( ئەم کتێبە لە سەردەمی خودی هیگڵ لە چاپ نەدرا، ئەو لە ساڵانی دواییدا هەوڵیدا هەموو نووسراوەکانی لە ناو بەرێت.)

لە ساڵی (١٧٩٦)ی ز هاورێیەکەی کە ناوی "هوڵدەرلین" بوو لە شاری (فرانکفۆرت)- واتە ئەو شوێنەی کە هۆنراوەبێژان لەوێ بە سەر دەبەن، پیشەی مامۆستایەتی بۆ هیگڵ دۆزیەوە کە ببێتە مامۆستای

مالان کە لە مالاندا وانە بلێتەوە، بەلام کاتێك هیگڵ چووە فرانکفۆرت، تێگەیشت کە "هولدەرلین" تووشی خۆشەویستی ژنێك بووە کە هاوسەرەکەی فەرمانبەری بانك بووە کە بۆ ئەم عەشقە دەسوتێت، هەر ئەو ژنەی کە "هولدەرلین" ئەوی بە نموونەو هێمای یۆنانی دێرین دادەنا. لەمڕووەوە هیگڵ بۆ جارێکی تر خۆی بە تەنیا بێ کەس بینیەوە. ئەو بۆ لەناوبردنی خەمۆکیو بێتاقیی خۆی، رۆژ بە دوای رۆژ زیاتر لە جاری جاران خۆی بە خوێندنەوە سەرقاڵ دەکرد. کاتێك دۆخێکی بۆ ئیسراحەت دەدۆزیەوە، دەستی بە هۆنراوەنووسین دەکرد کە دەربڕی خەمو پەژارە بوو، هۆنراوەکانی لە بواری ریتمو کێشی هۆنراوەیی کێشەی هەبوو:

"ئەو یاسا ژیرانە کە ناخی کەسی هەژاری لە زانین راگرتووە،
ئەو شتەی ئەو لە شەوێکی پیرۆزدا بینیویەتی
بیستوویەتیو
هەستی پێکردووە
تا ورینەکردنەکانی کە هەراوهووریاەکی زۆریان هەیە
ئوقرەیی والای
لە کاتی بیرکردنەوەدا نەشلەژێنێت
تا ژاوەژاویان
تووڕەیی بە سەر ناخی پیرۆزیدا دەرنەبڕێت
تا کارێکی پیرۆز
بەمشێوەیە لەگەڵ چلکنیو ناخی خراپدا

پێشێل نەکات..."

سەرەڕای ئەوەش هۆنراوەکانی هیگڵ دوو واتایی بوون بۆ نموونە ئەم دوو رستەیە لە چاوی خۆی‌و خوێنەردا دوو واتا دەدات: " تا ورینەکردنەکانی کە هەراوهووراپەکی زۆریان هەیە"و " ژاوەژاویان".

پسپۆڕیەتی هیگڵ لە نووسینی بابەتەکانیدا بێزارکەرو بێ ورە بوو.

لەم سالانەدا کە تەنیا بووە، هیگڵ تامی جۆرێك بیرکردنەوەی قووڵی چێشت کە ئەم رۆشنبیرییە بە شێوەی بینینی ناخی یەکبوون‌و یەکپارچەبوونی ئاسمانی کەون دەرخراوە. چونکە هەموو زۆرینە بێکۆتاییەکان، خەیاڵ‌و ناڕاستیەکان دێنە چاو، هەموو شت پێویست‌و پەیوەستە، هەروەها گشت یان تاك، راستیەکی بنەماییە. هیگڵ لەم سەردەمەدا بەرهەمەکانی فەیلەسۆفی جوولەکەیەکی دەخوێندەوە- واتە "ئەسپینۆزا"، وادیارە فەلسەفەکەی ئەسپینۆزا لەم رۆشنگەرییەدا کاریگەریەکی بەرچاوی هەبووە.

سیستمی فەلسەفی ئەسپینۆزا لە زۆر بوارەوە بە قەد سیستمی کانت شکۆدارو گەورەیە. ئەم سیستمە کە بە شێوەی هەندەسەی ئوقلیدۆسی بنیات نراوە، لە چەندین بنەوانەی سەرەکی‌و لێکدانەوەی بنەڕەتی دەست پێکراوەو پاشان بە هۆی چەندین مەسەلە، کۆمەڵێك نادیار بەوپەڕی پلەی رەسەنبوون‌و ژیرگەرایی بنیات دەنێت. کەون کە وەك سیستمێکی هەندەسەیە- خوایە، هەروەها بە تەواوی راستیش هەر ئەوە. (خوا، یان کەون کە بێکۆتاییە) هیچ جۆرە نەبوون یان دۆخی نەرێنی نیەو پێویستیی لۆژیك کە لە سەر بیرۆکەکانی ئەسپینۆزا زاڵە،

کاریگەری لە سەری هەیە. کاروباری گەون، شەڕەنگێزی، سنوردار و جیهانی بەرچاو کە ئێمە دەیبینین، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سروشتو خووی ئێمە کە بوونەوەری هەتاهەتاییو بە نرخین، لە هەمان کاتیشدا دەتوانین پێویستیی تەواو و گشت گەون کە راستیی بنەماییو راستەقینەیە، لێی تێبگەین.

دەرەنجامی بیرۆکەی ئەسپینۆزایی هیگڵ ئەمە بوو کە بڕیاری دا دەست لە هەندێ سەرقاڵی بەربدات وەك: هۆنراوە، ناسزا وتن، بوونی رۆژژمێرێکی ئەنێسکلۆپیدیائاسا. لە بری ئەوە، بوونی خۆی بۆ فەلسەفە تەرخان کرد. لەمە بەدواوە پاشماوەی تەمەنی خۆی بۆ دەربڕینو پێکهاتەکردنی بیرۆکەی ورەیی خۆی لە کەوندا تایبەت کرد، کە دەرەنجام بنەمایەکی ژیرانەو لۆژیکی بەم بیرۆکەیە بەخشی. ئاکامی ئەم بەرهەمە سیستمی گشتگیرو کۆکراوەیەتی.

ئەم سیستمە لە سەرەتاوە هاوشێوەییەکی زۆری هەیە لەگەڵ سیستمی ئەسپینۆزادا- هەڵبەت جیا لە راشکاوبوونی هەندەسی ( کە لە سیستمی ئەسپینۆزادا دەبینرێت). کاتێك ئەم سیستمە ڕوخساری خۆی دەرخست، هیگڵ بەردەوام بە شێوازی کانت کە بە دژوار لە شتەکان تێدەگەیت هاوڕا بوو، بەڵام ئەسپینۆزا بە هگێڵی سەلماند بە چ شێوەیەك خۆی لە کاریگەریی کانت رزگار بکات، تەنها سیستمی فەلسەفی بەس نەبوو.

لە ساڵی (١٧٩٩)ی ز باوکی هیگڵ مرد، هیگڵ داراییو سامانێکی کەمی بە میرات بەرکەوت کە "ویل دۆرانت" وتەنی: (١٥٠٠) دۆلار یان بە

واتایەکی تر ئەگەری زۆرە بە پارەی ئەڵمانی (۱۵۰۰) سالێر- ی بەرکەوتبێت (thaler= دراوێکی زیوی ئەڵمانیی سەدەکانی ۱۵ بۆ ۱۹ی زایینی بووە (وشەی دۆلار هەر لەم وشەیە وەرگیراوە، کە ئینگلیزی پێی دەوترێت : دالێرز.)

لەوە بەدواوە هیگڵ پارەی پێویستی لە بەردەستدا بوو بۆ بە سەر بردنی ژیانی. نامەیەکی بۆ (شلینگ)ی هاوڕێی نووسی‌و لێی پرسی ئایا دەتوانێت شارێکی پێ بناسێنێت لە ئاڵمانیا کە لەوێ بتوانێت بە مەسرەفێکی کەم بژیت، ئەو شارەی کە خۆراکێکی سادەی لە گەرەکاندا هەبێت لەگەڵ کتێبخانەیەکی گەورەو بیرەی خۆش ( Ein gutes bier)ی هەبووبێت. شلینگ لەو کاتەدا مامۆستای ناوداری زانکۆی "یەنا" بوو، ئەو مامۆستایە کە خێراو پێش کاتی چاوەڕوانکراو بە پلەی مامۆستایەتی زانکۆ گەیشت. خێرا هانی هگێل- ی دا کە بیباتە کۆڕی خۆی. (وادیارە بە پێچەوانەی ئەو زانینە کە فەیلەسوفەکان سەبارەت بە بیرە هەیانە، هیچ کامەیان سەلیقەیەکی باشیان نەبوو. ئەو بیرە گەرەکیانەی من لە (یەنا)دا بینیم بێگومان لە (بوندێس لیگا)ی بیرەکانی ئەڵمانیادا ناویان نیە. پاشان لەم راستیە ئاگادار بوومەوە کە ئەم بیرانە لە خانەی هەژارانی گەرەکەکاندا دروست دەکرێت.

هیگڵ لە ساڵی (۱۸۰۱)ی ز بەرەو (یەنا) رۆیشت، وەك مامۆستای ئازاد (Privatdozent) لە زانکۆدا دەستی بە کار کرد (واتە مامۆستای زانکۆ کە موچەکەی زانکۆ نایدات بەڵکو خوێندکارەکان دەیدەن. هیگڵ

لەم پیشەیەدا شانسی هەبوو کە دارایی تایبەت بە خۆی هەبوو: سەرەتا تەنها چوار خوێندکار لە پۆلەکەیدا هەبوو. (بە پێچەوانەی کانت، دۆخی میتافیزیای هیگڵ کە شێوازی نووسینەکانی زۆر خراپ بوو، بەڵام شێوازی وانە وتنەوەکەی زۆر باش بوو، هیگڵ وای بە باش دەزانی کە یەك ئاراستەو دۆخی هەبوو: شێوازی وانەوتنەوەکانی بە هەمان رادە خراپ بوو کە شێوازی نووسینەکانی خراپ بوو).

زانکۆی یەنا لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا، بەگڕوتین ترین زانکۆی ئەڵمانیا بوو. "شیلەر" وانەکانی خۆی جار نا جار لەبارەی مێژوو دەوتەوە. برای "شلگیل" و "نەوالیس" لەوێ یارمەتیی دامەزراندنی یەکەمین قوتابخانەی رۆمانتیزمی ئەڵمنیایان دەکرد، هەروەها "فیشتە"ی بیرۆکەسازی مەزن سەرقاڵی شرۆڤەو لێکدانەوەی نوێترین فەلسەفە بوو کە زیاتر لە کانت پێوە سەرقاڵ بوو. کاتێك هیگڵ سەرقاڵی وانە وتنەوە بوو لە زانکۆی "یەنا"، هەموو ئەم هۆنراودبێژانە ئەوێیان بەجێهێشتبوو، بەڵام لە بری ئەوانە "شلینگ"ی تەمەن (٢٦) ساڵ بە گڕوتینی رۆمانسیزمی فەلسەفە سروشتیەکەی خۆی واتابەخشی خوێندکارەکانی بوو. ئەم دۆخە بە توندی هگێڵی دەبزواندو ئەوەندەی نەخایاند کە پێکهاتەی نەگونجان و کێشمەکێشی لەگەڵ "شلینگ" دانا.

لەم نێوانەدا سەرەڕای رێژەی خوێندکارەکان لە پۆلەکەیدا بووە (١١) کەس، وردە وردە داراییەکەی هیگڵ کۆتایی پێهات. بە هەر حاڵ بە هۆی ئەوەی کە رێگای ئاسانی هەڵدەبژارد، لێی دوور دەبووەوە.

بەوجۆرە کە ژوژو و درگی بە سەر پشتەوەیە، هگێل- یش پتەوی لە سەر کەسایەتیی بوو. تەنانەت بۆ یەك چرکەش راڕایی نەبوو کە وانەکانی بکاتە دۆخێکی سەرنجراکێش یان تەنانەت شیاوی تێگەیشتنی بکات. لەم کاتەدا دەستی بە کار کردبوو تا سیستمی مەزنی خۆی پۆلێن بکاتو وادیارە وردە وردە بەوجۆرەی کە بەرەو پێشەوە دەچوو، ئەوەی بۆ قوتابیەکانی شیدەکردەوە. یەکێك لە قوتابیەکانی بۆ ستایشی نوێی هیگڵ وەسفی دەکات: "پێش ئەوەی لە سەرەتای کاردکانی زمانی تەتەڵەی دەکرد، بە زۆر درێژەی بە کاری خۆی دەدا و سەر لە نوێ دەستی پێدەکرد. بۆ جارێکی تر لەناکاو رادەوەستا، قسەی دەکردو بیری لە شتەکان دەکردەوە: وادیارە کە تا ئێستا بە دوای وشەیەکی تەواو بوو، رێك لەم کاتەدا ئەو وشەیە بە راستیو دڵنیاییەك دوور لە هەڵە دەگەیشتە زەینی. گوایە لە پۆلەکەیدا وا هەست دەکرا ئاگاداری شتێك بووەتەوەو چاوەڕێی شتی زیاتری دەکرد بۆ وانە وتنەوە، بەڵام ئەم هەموو شتە، تەنها خەونو خەیاڵ بوو. بیر لە بری ئەوەی پێش بکەوێت، لەگەڵ ئەو وشانەدا بۆ چەندین جار بە دەوری ئەو شتانەدا دەسوڕایەوە. سەرەڕای ئەمانەش ئەگەر هۆشی هیلاکمان بۆ چرکەیەك دوور دەخرایەوە، لە کاتی گەڕانەوەدا تێدەگەیشتین کە زنجیرەی باسەکەمان لە دەستمان دەرچووە." بە بیری خۆتانی بهێنن کە ئەم وەسفکردنە تایبەت بە خوێندکارێکی لاینگرو بەگڕوتینە. تەنها دەتوانین بیر لەوە بکەینەوە کە ئەم شێوازە لە سەر خوێندکارانی بێ

شانس کە شەوانیان لە هەژارخانەکاندا بە بیرە خواردنەوە بە سەر دەبەن، چ کاریگەریەکی دادەنا.

سەرەڕای ئەم شتانە، ئەوانە لەگەڵ هیگڵ دا دەیانتوانی چی بکەن؟ دەرەنجام کەسێك خۆی کردە هاوڕێی "گوتە" کە ئەندامی لیژنەی (رادەربڕینی پسپۆڕانە = Privy Councilor) لەبارەی "وایمار" کە لەو شوێنەوە نزیك بوو هەروەها بە سەر کاروباری ئەوێدا زاڵ بوو. هیگڵ نازناوی باشترین مامۆستای لە خۆ گرتو موچەی سەد دۆلاری سەردەمی خۆیی پێدرا.

ئەم دۆخە وای کرد تا هیگڵ بتوانێت نووسینە مەزنە فەلسەفیەکەی بە ناوی "دیاردەناسی ورە= The Phenomenology of Mind " بەرەو پێش بەرێت، بەڵام چالاکیەکانی هیگڵ لە جیهانی دەرکەوتەدا بە گشتی تایبەت بە کاروباری زەینی نەبوو، چونکە هەر لەم کاتەدا خاوەن ماڵەکەی کە ژن بوو، دووگیان کرا. ئەم راستیە لە ژیاننامەی هیگڵ دا وەك زێڕێکی دەگمەن ئاشکراییو رووناکی لە نووسینەکانی دا لە ناکاو دەردەکەوێت، دۆخێکی تێپەڕکراو کە لە کۆمەڵەی دیاردە ئاڵۆزەکاندا دەمرێتو ون دەبێت، بەڵام سیستمی فەلسەفەی هیگڵ سیستمێك بوو کە تیایدا ئەگەری بوونی هەبووبێت کە راستی هەندێجار تا ماوەیەکی زۆر دوای مردن دروستکەری ئەو سیستمە داپۆشرێت: خاتوونی خاوەن ماڵی، هیگڵ ی بە تاوانبار زانیو تاوانباری کرد.

لەو کاتەدا ناپلیۆن وردە وردە لە ئەوروپادا پەرەی سەند. وڵاتی پرۆس تووشی شەڕ بوو، لە ساڵی (١٨٠٦)ی ز سوپای فەرەنسا بەرەو "یەنا" رۆیشتن. هیگڵ کە لە سیستمی ئیدارەکردنی حکومەتی پرۆس بێزار بوو، پێشوازیی لە ناپلیۆن کرد، بەڵام ئەم پێشوازییە لە راستیدا پاشماوەی گڕوتینی شۆڕشەکەی لە گەنجێتیدا نەبوو، بەڵکو هیگڵ هەستی بەوە دەکرد کە بەم کارە لە رەوتی مێژوودا کە بە گوێرەی سیستمەکەی جێبەجێ دەبوو، ئەو شتانە دەسەلێنێت. "ناپلیۆن، کە رۆحی جیهانە- بینیم بە ناو شاردا بە سەر ئەسپەوە دەگەڕا". رۆژی دوایی سەربازە فەرەنسیەکان دەستیان بە تاڵان کردو بەرەو ئەو ماڵانە فیشەك و ئاگریان باراند کە خانووەکەی هیگڵ لەوێ بوو. هیگڵ کاتێك دەسنووسەکانی کتێبی "دیاردەناسیی ورە"ی نابووە گیرفانی کۆتەکەی، بەرەو ماڵی مامۆستایەکی زانکۆ هەڵات کە لەو نزیکییەدا بوو. ( لە سەر ئەستووری ئەم بەرهەمە دەتوانرێ شیمانە بگرێت کە دەبوایە کۆتێکی زۆر گەورەی لەبەر کردبێت). لێرەدا هیگڵ کاتێك سوپای فەرەنساو ئەڵمانیا لە دەرەوەی شار بەرامبەر بە یەك شەڕیان دەکرد، دوایین شاکاری خۆیان نووسی. چیرۆکێك لە ئارادایە دەڵێت کاتێك ناپلیۆن دەنگی ئەو سەربازانەی بیست کە لە شەڕ دەگەڕانەوە، دەستی لە کار کێشایەوەو لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کردو پرسیاری کرد: "کێ سەرکەوت؟"

لە شەڕی شاری "یەنا"دا، سوپای فەرەنسا سەرکەوت، ئەوسا هیگڵ شادو دڵخۆش بوودوە. ورەی جیهان بۆ پێشکەوتنی خۆی لە جیهانی بیڕوردا دریژەی پێدەدرا.

بەڵام پاش شەڕ، بە ناچار زانکۆ داخراو بۆ جارێکی تر هیگڵ خۆیی بێ پارەو دارایی بینیەوە، ناچار بوو بەو موچەیە کە وەریدەگرت ژیانی بە سەر بەرێت. پاش ساڵێك "دیاردەناسی ورە" بڵاو کرایەوە.

ئەم کتێبە بە گشتی بە ئاڵۆزترینو کارامەترین بەرهەمی هیگڵ دەژمێردرێت. پێش ئەم دۆخە، کانت (٨٠٠) لاپەڕەی وەك پێویست بۆ بابەتێکی فەلسەفی دانابوو، هیگڵ لەم بەرهەمەدا پیشانی دا کە بە پێوانەی خۆی هاودەنگە، بەڵام تا ئەو رادەیە تە هیگڵ لە کانت زۆر پێش دەکەوێت، زۆرنووسینی بابەتەکانیەتی. من بە ئەنقەست رستەیەکی ئاشکراترو ساکارتری ئەوم هەڵبژاردووە تا نموونەیەکم دابێتە دەست: "لەم نێوانەدا بەوجۆرەی کە زەین- خۆی هەبوونێکی سادەی سەربەخۆ نیە، بەڵکو سیستمێکە لە سەر پێکهاتەکان کە خۆی تیایدا لێکدەداتەوە، بەڵام لەم قۆناخە جیاکاریو جیاکردنەوەیەدا، بە ئازاد جیای دەکاتەوە، هەروەها کە زەین بە شێوەی گشتی شێوازی جۆراوجۆری کارکردن دەخاتە سەر جەستەی خۆی، هەموو ئەندامێکی تایبەت لە جەستە بۆ ئەنجامدانی ئەرکێك لە بەر چاو دەگیردرێت، لەمڕووەوە دەکرێ دۆخی دەروونیەکەی خۆی دەربخات وەك شتێك کە لەو بەشانەیە کە بەردەوام پێکهاتووە.

ئەگەر بمانەوێ "کێچێك بکەینە کێوێك" واتە رستەیەك بە جیاواز لە بەر چاو بگرین، ئەوە شتێکی پێکەنیناوییە. بەڵام پاش خوێندنەوەی چەندین لاپەڕە، ئەگەری هەیە ئەو نوکتانە بێزارکەر و بێ واتا دەبینیەوە.

سەرەڕای ئەمەش نەکا ئەم بیرکردنەوەیە لە ئاراستەی مەبەستمان لامان بدات کە هەموو کتێبەکە هەر بەمشێوەیە نووسراوە. هیگڵ وردە وردە جۆرێك (گەشیتن بە ئاستی خواوەندی = Apotheosis) لە رادەبەدەر و بێ ئەملاو ئەولا پەروەردە دەکات کە تیایدا " هوشیاری تەواو= Absolute Knowledge) دەردەبڕا. تەنانەت وێناکردنی شەش دێڕ کە سەرانسەری ئەوە بە گشتی واتای نیەو دژوارە، بەڵام هەر لەم کاتەدا هیگڵ بەمجۆرە ویستبووی و دەیتوانی لە نووسینی چەندین بابەت بەمشێوەیە لە ئەستۆ بگرێت، بە بێ هیچ وەستانێك، بۆ نموونە: "ناسینی دۆخی (تۆمارکردن = notions)ی رەسەنی هوشیاری بە شێوەیەك کە تیایدا دۆخی تۆمارکردن یان شێوازەکان هوشیارن، لایەنی راستەقینەیان پیشان دەدات کە لە سەر بنەمای هەستی سروشتییان واتە دۆخی تۆمارکردن بە دەرکەوتنیان لەوێ لە چالاکی نێوانجێتی سادەدا لە دۆخی بیرکردنەوەدا، قۆناخی ئەو نێوانجێتیە شیدەکاتەوەو لێکی دەداتەوە، ئنجا بە گوێرەی ناکۆکی دەروونییان بە خۆیانی پیشان دەداتەوە."

هیگڵ پێداگر بوو کە ئەم کتێبە هەولێکە بۆ ئەوەی بە فەلسەفە بڵێت چۆن دەبێ بە زمانی ئەڵمانی قسە بکات." هەندێ کەس بڕوایان وایە

که هیگڵ لەم کارەدا توانی سەربکەوێت، بەڵام ئەم بیرۆکە شێتانەو بە ئەدەبە وەك جنێودانە بە زمانی ئەڵمانی واتە زمانی "هوڵدەرلین"و (ریکله). رەنگە هیگڵ دەبوایە پێش ئەوەی هەوڵبدات شتێك فێری فەلسەفە بکات، خۆی فێری قسەکردن بە زمانی ئەڵمانی دەکرد.

بەڵام سەرەڕای ئەمانە بە تەواوی چ شتێك واتای هەیە؟ هیچ کەس ناتوانێت بەرهەمێکی (٨٠٠) لاپەڕەیی بە هەموو زمانێك بخولقێنێت بە بێ ئەوەی ئەو بەرهەمە واتایەکی هەبووبێت. زۆربەی توێژەران ئەم بڕوایەیان کردووەتە تووشەی خۆیانو ئازایەتیان بە خۆیان داوەو چوونەتە ناو نووسینەکانی هگێڵەوە. هەندێکیان لە چوارچێوەی مارکسیزم هاتوونەتە دەرەوە، ڕێژەیەکی تریان لە چوارچێوەی ئەگزیستانسیالیزمو هەندێکی تر ئەو کەسانەن کە بە تەواوی نەهاتوونەتە دەرەوە واتە (هگێل)یەکان. هیگڵ لە کۆتاییدا بۆ کورتکردنەوەی فەلسەفەکەی، دە بەرگ کتێبی نووسی. (چاوەڕێ دەکرێت کە چاپی نوێ لە کۆتاییدا بەرهەمەکانی بە هۆی هەوڵدانی (دۆیچە فورشۆنگ گماینەشافت) واتە (لیژنەی توێژینەوەی ئەڵمانی) زیاتر لە (٥٠) بەرگ ببێت.) لەمڕووەوە هەرجۆرە هەوڵدانێك بۆ کورتکردنەوەی بیرۆکەی هیگڵ وەك وایە هەوڵبدەین لە ئێسکی بچوکی کۆتایی کلکی دایناسۆرەوە لەوە تێبگەین کە ئەم ئاژەڵە زلەیە کە قاچی بە زەویدا دەداو ئێستا لەناو چووە، ئەم ئێسکە تایبەت بەوە.

هیگڵ لە (دیاردەناسیی ورە)دا دەرەنجامی لۆژیکی شرۆڤە دەکات کە تیایدا زەینی مرۆڤ لە لوتکەی هوشیاری سەرەتاییو بە تێپەڕبوونی لە

قۆناخی خۆ وریایی: ژیر، وەرەو ئاین تا پلەی هوشیاریی تەواو، یان نوقمەسار دەبێت یان سەردەکەوێت. ئەمە گەڵاڵەیەکە کە هیگڵ لە سەر ئەو بنەمایە، سیستمی گشتیو شکۆداری خۆی بنیات بنێت.

سیستمی هیگڵ بە بێ جیاوازی هەموو شتێك لە خۆ دەگرێت. (وەڵامی ئەم پرسیارە کە ئایا ئەم سیستمە سەبارەت بە هەموو شتێك بە بێ جیاوازی راستە یان هەرگیز لەبارەی هیچ شتێکەوە لە راستیدا پشت راست ناکاتەوە) بەندە بەوەی سەبارەت بە پێکهاتەی بنیاتیو جووڵێنەری چ بیرکردنەوەیەکمان هەبووبێت. گشت سیستمەکە لە سەر بنەمای شێوازی پێوانەکردنی نوێی هیگڵ- واتە شێوازی بەناوبانگی دیالێکتیکیەتی. ئەم شیوازە لەگەڵ "بنیاتی بیرۆکە"، یان تێزێك دەست پێدەکات وەك: بنیاتی کەون. بە بڕوای هیگڵ، تێز (بیرۆکە) بە گوێرەی پێویست ناتەواو و کەموکوڕە. کاتێك سەبارەت بە وێنای هەبوون قووڵ دەبینەوە، واتە وێنایەك کە دژە خۆمان دەریدەخەین- لە بەرامبەر بنیات یان دژە بیرۆکە (ئەنتی تێز)ی خۆمان، نەبوون پێکدێنێت. ئەوسا ئەم وێناکردنەی دووهەم ناتەواو و کەموکوڕ دێتە بەرچاو و لەم کاتەدا هەر دوو دژەکە (بیرۆکەو دژە بیرۆکە) ئاوێتە دەبن تا پێکەوە "هاو بنیات"ێك یان "نوێ بیرۆکەیەك" پێکبێت کە لەم نموونەیەدا، هاوبنیات یان نوێ بیرۆکە بریتیە لە "بوون". ئەم نوێ بیرۆکەیە کە هەم لە بیرۆکەو هەم لە دژەبیرۆکەدا دۆخێکی ژیرانەیە، دەپارێزرێتو خۆی دەتوانێ ببێتە بیرۆکەیەکی تر. ئەم کارە ئەگەری ئەو دەرەخسێنێت کە پێکهاتەی باسکراو لە زنجیرەیەك تایبەت

بە (سیکوچ)ەکەکان دووپات ببێتەوەو تا دۆخی ژیرانە زیاتر والا ببێت. ئەم پێکهاتەیە هەرچەند ژیرانەتر دەبێت لایەنی رۆحانی یان ورەیی زیاتر دەبێتەوە، هەروەها کە رۆحانی تر دەبێت، بە هۆی خۆی و ناوەرۆکی واتای ناخ- هوشیارییەکی زیاتر دەدۆزێتەوە. پێکهاتەی باسکراو بەرەو هوشیارییەکی تەواو واتە پلەیەك کە تیایدا " ورە خۆی لە پلەی ورەدا دەناسێتەوە" کۆتایی پێدێت.

کەواتە بنەمای سەرەکی ئەم سیستمە دیالێکتیکە کە لە هەموو ئاستێکدا کار دەکات، هەر لە والاترین دۆخی ورەوە بگرە تا نادیارترین‌و تاریکترین پێکهاتەی مێژوویی، هونەر، زانست‌و شتی لەم شێوەیە، نموونەیەکە لە دیالێکتیکی هیگڵ لەم ئاستەدا کە وەك لای خواردوە شرۆڤە دەکرێت:

***<u>بنیات: نەخشەدانان</u>***

***<u>یەکسان لەگەڵ بنیاتدا: هونەری رۆمانسیزمی</u>***

***<u>هاو بنیات: پەیکەرتاشینی دێرین</u>***

ئەوەمان لە بەر چاو نیە ئایا ئەم هەڵسەنگاندنەی لای سەرەوە پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەو شتەی لە راستیدا دەیبینین یان نا. ئەم نموونەیەمان بۆ ئەوە هێنا کە شێوازی هیگڵ‌و جۆری هەوێنەکان یان ئەو شتانەی کە دەیکاتە مەکینەی گشتگیری خۆی، پیشانی بدەین. نموونەیەکی نادیارتر بەمشێوەی لای خوارەوەیە (کە هەڵبەت شێوازی هیگڵ لەگەڵ ئەوەدا گونجاویەکی زیاتر هەیە):

***بنیات: گشتاندن***

***یەکسان لەگەڵ بنیاتدا: ئەندامبوون***

***هاو بنیات: تاکەکەسی***

شێوازی دیالێکتیکی هیگڵ (کە وەك لۆژیك باسی لێ دەکرد) سەرچاوەکەی بە هۆی ئامانجێکی شایستەوە بوو. هیگڵ دەیویست بە سەر گرنگترین کەموکۆڕیو لاوازیی لۆژیکی کلاسیکدا زاڵ ببێت، واتە ئەم راستیە کە لۆژیکی کلاسیکی بە شێوەیەکی بێ ناوەڕۆکە کە هیچ واتایەکی نیە. لۆژیت تەنها زانیاری لە سەر خۆی بڵاو دەکاتەوە نەك لە سەر شتێکی تر. بۆ نموونە: تێگەیشتنێکی کلاسیکی، وەك تێگەیشتنی لای خوارەوە لە بەر چاو بگرن:

***هەموو فەیلەسوفەکان تووشی خۆ بە زلزانی ژیری بوونەتەوە.***

***هیگڵ کەسێکی فەیلەسوفە.***

***لەمڕووەوە هیگڵ تووشی خۆ بە زلزانی ژیری بووەتەوە.***

ئەگەر ئەم تێگەیشتنەش لەبارەی سیحربازەکانو "مرلین= Merlin سیحربازی ئەفسانەیی ئارتوور پاشا"وە بوایە، لە بواری لۆژیکیەوە شێوەیەکی زۆر یەکسانی هەبوو، بۆیە دەگرێ بەمجۆرە بنووسرێت:

***هەموو ئەلفێك، (ب)یە.***

***ج، ئەلفە.***

***لەمڕووەوە ج، (ب)یە.***

جیا لە ناوەڕۆکی تێگەیشتنەکە، دۆخە لۆژیکیەکەی بە یەکسانی دەمێنێتەوە. لە ڕوانگەی هگێلەوە ئامانجی لۆژیك بە دەستهێنانی ڕاستیە، بەڵام ڕاستیەکی بۆش کە ناوەڕۆکی نیە، ئەوە هیچ سوودێکی نابێت. ڕاستیەك کە هیچ ناوەڕۆکێکمان پێنادات و ناتوانێت ڕاستیە پێویستەکان بدۆزێتەوە. هیگڵ دەیویست زاڵ بێت بە سەر جیاوازی ڕوتین و ناوەڕۆك.

تێگەیشتنی بەمشێوەیە بوو کە باسی دەکەین. هیگڵ دەیویست ئەم تێگەیشتنە لە هەبوونە گشتیەکەیدا فێر بکرێت. (دڵنیامان دەکاتەوە کاتێك ئەم تێگەیشتنە لە هەبوونە گشتیەکەیدا ببینرێت، چارەسەری ئەو پرسیار و ناڕاستەوخۆ قسەکردنە لۆژیکیانە دەکات کە ئەگەری هەیە زووبڕواهێنان و سادەییمان لە بەرامبەر ئەو دۆخانەدا بێتە ئارا.)

هیگڵ تێگەیشتنەکەی بەم ڕستەیە دەست پێکرد کە لۆژیك هەڵسەنگاندنی بیرۆکەیە. بەوجۆرەی باسمان کرد: دەرەنجامی دیالێکتیك تا ئاستی زەین یان ورەی لۆژیکی تێپەڕ دەبێت. زەین، لۆژیکی ڕاستەقینەیەکی بنەڕەتی و جیاوازە لە دۆخی تایبەت و ناپەیوەست کە لە جیهانی سروشتیدا بە خۆیەوە پەیوەستی دەکات. زەین، دۆخێکی تەواوە کە جیهان پێکیدێنێت. لەمڕووەوە خوێندنەوەی شێوازی جووڵەو کارکردنی زەین (بیرۆکە)، شێوازی کارکردن و جووڵەی جیهان ئاشکرا دەکات.

لەو تێگەیشتنەی لای سەرەوە، ئەم دەرەنجامە بە دەست دێت کە هیچ جۆرە ڕاستیەکی بەرچاو لە ئارادا نیە کە سەربەخۆ یان جیا بێت لە

بیرۆکە. لە راستیدا هیگڵ لە کتێبی (دیاردەناسی ورە) تێدەگات‌و هەڵدەسەنگێنێت کە بیرۆکە، راستیەکی بەرچاوە- هەروەها راستیی بەرچاو، هەمان بیرۆکەیە واتە (ئەو شتەی راستە، شتێکی لۆژیکییەو ئەو شتەی ژیرانەیە، راستییە). ئەم دوانە یەك شتن‌و وەك یەكن. ئەم قسە بەو واتایە دێت کاتێك لۆژیك پەیوەستە بە بیرۆکەوە، کەواتە بە راستیەوە پەیوەستن. لەمڕووەوە مەسەلەی لۆژیك بریتیە لە: "راستی، بەو شێوەیە کە لە ئارادایە."

کەواتە، دیالێکتیك لەگەڵ سێ بنەمای "بیرۆکە"، "دژە بیرۆکە"و "بیرۆکەی نوێ"، هەم شێوە بوونی هەیە- هەم ناوەڕۆك. دیالێکتیك "هەر بەو ڕێگایەدا دەڕوات کە زەین تێپەڕی دەکات"و لەگەڵ "راستیدا بەوجۆرە کە لە ئارادایە" دەجووڵێتەوە. بیرۆکە یان ئەندێشەیەك، بە هۆی لاوازی دۆخی خۆی و بە هۆی خۆگونجاندن‌و سازگارکردنی ناوەڕۆکەکەی لە هەبوونیدا، دژە بیرۆکە یان ئەندێشەیەك بەرامبەر بە خۆی پێکدێنێت، وەك بیرۆکەی هەبوون کە بە گوێرەی پێویست دژەبیرۆکەی خۆی واتە نەبوون پێکدێنێت‌و ئەوسا هەر دووکی پێکەوە ئاوێتە دەبن‌و بیرۆکە نوێیەکەی خۆی واتە "بوون" پێکدێنێت.

ناکرێ حاشای لێبکەین کە ئەم سیستمە، زنجیرەیەکی بەربڵاوی بیرۆکەی بەرچاو، قووڵ‌و بیر بزوێن پێکدێنێت، بەڵام لە راستیدا ئەمانە تەنها بیروڕای شاعیرانەیە. راستی لەمەدایە کە هەموو سیستمە بیرۆکەییەکەی هیگڵ لە بنەمادا بیرۆکەیەکی شاعیرانەی جوانە. بە داخەوە ئەم پەپوولەیە سنجاخێکی لێدراوە کە ئەو سنجاخە بە پوتك

زەربەیـەکی تونـدی لێـدراود کـە پەپوولەکـە رابگرێـت. هـەروەها لـە زۆربەی بەشەکانی لای خوارەوەی هرەمەکە، ئـەم بیرۆکانـە بەمشێوەیە دێن:

***بیرۆکە: ئاینی جوو.***

***دژە بیرۆکە: ئاینی رۆما.***

***بیرۆکەی نویٚ: ئاینی یۆنانی.***

دیسانەوە نموونەیەکی تر:

***بیرۆکە: هەوا.***

***دژە بیرۆکە: زەوی.***

***بیرۆکەی نویٚ: ئاگر و ئاو.***

لێرەوە دەتوانین لەوە ئاگادار بین بە پێچەوانەی پێداگریی هیگڵ کە سیستمەکەی خۆی بە پێویست دادەنا (بە واتای لۆژیکی وشە). ئەم سیستمە زیاتر لە سەر بنەمای ئەگەرو بەرێکەوت بوو. لۆژیکەکەی هیچ بەهردیەکی لەو وردبینیە کە وەك نموونەیەك لە سیستمی هەندەسی (ئەسپینۆزا)دا دەبینرێت، بوونی نیە. هەروەها کە دەبینین کاتێك ئەم لۆژیکە بەرەو بواری جێبەجێکار وەك مێژوو دەڕوات، بە راستی ئەگەری هەیە بیرۆکەی زۆر باش و تۆقێنەر بخولقێنێت. (وێنای رێبەرێکی نەتەوەیی کە وێناکردنی "ورەی جیهانە". ئەگەری هەیە لە سەردەمی ناپلیۆندا پاساوێکی شاعیرانەی هەبووبێت: بەلاّم کاتێك لە بەر تیشکی ئەزموونەکانی سەدەی بیستەمدا بیر دەکەینەوە، بە دڵنیاییەوە بیرۆکەیەك شیاو لە ئارادا نیە کە پەسەند بکرێت).

سەردرای بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە ئەستوورە، دیسانەوە هیگڵ بێ پارە بوو. زانکۆ کاتێك دادەخرا، هیگڵ بە دوای کارێکی تردا دەگەڕا تا پیشەیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە، بەلاّم لەم کاتەدا دەرەنجامێکی دیالێکتیکی کە ڕاستەوخۆ هگێڵی لە خۆ دەگرت، بیرۆکەی نوێیەکەی پێکهێنا: خاوەن ماڵەکەی هیگڵ کوڕێکی بوو ناوی نا "لودویگ".

پاش ماوەیەکی کەم، هیگڵ شاری "یەنا"ی بەجێهێشت تا ببێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (بامبۆرگەر سایتۆنگ = Bamburger Zeitung) دەستی بە کار کرد، بۆ ماوەی دوو ساڵ لەو پیشەیەدا مایەوە. بەداخەوە ئێمە تەنها دەتوانین سەردێڕی بابەتەکانی ببینین، چونکە وادیارە هەموو ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیە لە بەرواری (١٨٠٧ بۆ ١٨٠٨) ڕووبەڕووی دەرەنجامی بەروارێکی بە ڕۆحانی کراو بووەتەوەو لەناو چوون.

لەم کاتەدا هیگڵ لە تەمەنی (٢٨) ساڵیدا بەڕێوبەری خوێندنگەیەکی ئامادەیی بوو لە نۆرەمبێرگ. ئەم پیشەیە کە هەشت ساڵ پێوەی سەرقاڵ بوو، بە ڕادەی پێویست کاتی ئیسراحەتی لە بەر دەستدا بوو تا درێژە بە کارە فەلسەفیەکانی بدات. لەم کاتەدا هیگڵ زۆر دەمێك دەستی لە بیرۆکەی "ئازاد کردن"، یان "ئازادی بەخشی و ئەزموون کردن"ی شۆڕشیانە بەردابوو، ئنجا بە گرۆتینێکی زۆر بڕوای بە دژە بیرۆکەکەی هێنابوو. هیگڵ پیشەی بەڕێوبەری خوێندنگەی هەبوو، دەیوت: "ئامانجی هەموو پەروەردەو فێرکارییەك، بنبڕکردنی وێناکردنو بیرکردنەوەو بیری تاکەکەسییە کە ڕەنگە گەنجەکان

هەیانبێتو لە مێشکیاندا گەشەی پێبدەن، بیرکردنەوە هەمان ئیرادەیە. دەبێ گوێ بە فەرمانەکان بدات."

هەر وەك چۆن زۆربەی بەڕێوبەرانی خوێندنگە نارەزوویان لە پیشەکەیان نیە، یان کەسانێکن بە تەواوی تەمەڵن، بەمجۆرەش هیگڵ بەڕێوبەرێك بوو کە شتەکانی بە دژوار دادەنا. کەسێك کە بە هۆی دۆخی خوێندنی وانەکانی، هگێلی لە خشتە دەبرد، بەرەو پێشوازی مەترسی رۆیشتبوو. یەکێك لە خوێندکارەکانی دەیگێڕێتەوە کە "منو یەکێکی تر لە مندالان پێکەوە رۆیشتبووین تا رەخنەو گلەییەکانی خوێندکاران بخەینە روو، بەلام چ میوانداریەکیان لێکردین. هەر نەمزانی چون لە پلیکانەکان هاتینە خوارەوە."

لەم کاتەدا دژەبیرۆکەی سەیروسەمەرەیەکی تر روویدا: هیگڵ عاشق بوو. تێگەیشتن لەم واتایە رەنگە بۆ هەندێ کەس بە ئەندازەی تێگەیشتنی وێنای دیالێکتیکیی هیگڵ بە تەواوێتی دۆخێکی دژوار بوو. هیگڵ لەو کاتەدا تەمەن چل ساڵ بوو، بە بێ ئەوەی بە هەڵەدا بچێت، بە سەڵتی مابووەوە. پاش چەندین ساڵ خوێندنی بێوچانو بەردەوام، کاریگەریی ناخۆشی خۆی لە سەر دانابوو. روخساری گرژو رەنگ زەردی هیگڵ- تووشی پیریەکی چاوەڕوان نەکراو بە گوێرەی تەمەنی ببوو. مووەکانی رۆژ بە دوای رۆژ زیاتر دەوەری، تەنها شتێك کە لە روخساری مابووەوە، بریقەیەکی بە ئەدەب لە چاوانیدا بوو. هیگڵ بالای کورتو جەستەیەکی پری هەبوو، سەرەڕای ئەمەش پشتی چەمابووەوە. ئەدەبو رەفتاری کۆمەلایەتیی هاوکات بوو لەگەڵ

پەشۆکاوی‌و ناشیبوونێکی زۆر تیایدا. وادیار بوو "گیۆرك ویلهێلم فریدریش هیگڵ" تەنانەت، لە بەرچاوی خوێندکارەکانی کە زۆر لاینگری بوون، سەرنجڕاکێشانێکی سیحراوی نەبوو. هیگڵ گیرۆدەی عەشقی کچێك ببوو بە ناوی "ماری فۆن تووشەر" لە بنەماڵەیەکی نۆرەمبێرگی کە ناویان بە رەسەنی‌و باشی دەرکردبوو، ئەو کچە تەمەنی (١٨) بوو.

"ماری" لاینگری رۆمانەکانی "ژان پوڵ" بوو کە نووسەرێکی کۆنی رۆمانە هەستیارەکان بوو کە بە لای خەڵکەوە پەسەند بوو کە بڕوای بە هەندێ باوەڕی رومانتیکی هەبوو وەك: "هەست"و "شێوازی وەستانی شەهوەتیانە". هیگڵ، چەندین هۆنراوەی شکۆداری بۆ نووسی کە تیایدا بە شێوەیەکی وردبینانە چۆنیەتی دیالێکتیکی خۆشەویستی شیدەکردەوە. تەنانەت کاتێك یەکتریان لە جیێژوان دەبینی، هیگڵ بۆ ماوەیەکی زۆر لە کاتی یەکتر بینینیاندا وەك مامۆستای خوێندنگە دەمایەوەو زۆرجار لە بەرامبەر بیرکردنەوە رومانتیکی‌و شەهوەتیەکانی "ماری"، دۆخێکی لۆمەکەرانەی لە خۆ دەگرێت. پاش ماوەیەك لە نامەکانی داوای لێبوردنی لێکرد:

**نامەکەی هیگڵ بۆ ماری- ی خۆشەویستی:**

***"دانی پیادادەنێم، کاتێك ناچار دەبم بنەمای ئەخلاقی پێشێل بکەم، خێرا هێزی دەست نیشانکردنی رەفتارو کردەوەکان کە لەم بنەمایەدا بەرچاوە، لە کەسێکی تایبەت وەك تۆدا لە دەستی دەدەم، هەروەها دانیپیادادەنێم کاتێك ناچار دەبم بنەما ئەخلاقیەکان بنێمە ژێر پێ،***

*زۆر لە خێرایی ئەو توانایيانە کە بۆ دەست نيشانکردنی رەفتارو کردەوەکان لەوانەدا دەبينرێن، لە کەسێکی تايبەتدا دەيبينم- بەتايبەتی لە تۆدا. ديسانەوە دانيپيادادەنێم پێمخۆشە سوور بم لە سەر ئەم بنەمايانە، چونکە لەم بنەمايانەدا ئەو لايەنە گشتیو گرنگييەی هەيانە، دەيبينم: ئەو شتەی کە تۆ بيری لێناکەيتەوەو لە راستيدا بە رای تۆ هەرگيز ئەم لايەنە گشتیو گرنگە تێدا بوونی نيە."*

مرۆڤ لە خۆی پرسيار دەکات ئەگەر "ماری" دارێکی "ئازادی" لە سەر شەقامدا بناشتبا- واتە ئەو کارەی کە هيگڵ لە تەمەنی ئەودا کردبووی- لەمرووەوە هيگڵ چيی پێ دەوت؟ سەرەڕای ئەمانەس راستيەکە ئەمەيە کە "ماری" واديار بوو وەڵامی خۆشەويستی گرژبووی کۆنو کۆن مەزاجی خۆی داوەتەوە.

ئەوانە لە ساڵی "١٨١١" پێکەوە هاوسەرگيريان کرد. مەراسيمی هاوسەرگيريەکەيان کۆڕێکی گەرم بوو کە هەڵبەت هاتنی چاوەڕوان نەکراوی ژنە خاوەن ماڵەکەی هيگڵ لە شاری "يەنا"و ئەو هەراوهووريە لەو کۆڕەدا نايەوە، تۆزێ ئەوەی تێکدا. بە شڵەژاوييەوە لەتە کاغەزێکی بە دەستی تەکان دا، وای سەلماند ئەم لەتە کاغەزە بەڵێنی هاوسەرگيرييەکی نووسراوەيە کە هيگڵ پێيداوە. بە گوێرەی ئەو قسانەی دەيگێڕنەوە، دەرەنجام خاوەن ماڵەکەی "لێی خۆش بوو و باجی لێوەرگرت."

بەڵام ئاگرێکی کۆنی دێرین لە ئارادا بوو کە بەم ئاسانیانە نەکوژایەوە. کاتێك "کریستین" واتە خوشکەکەی "هیگڵ" هەواڵی هاوسەرگیری براکەیی بیست، تووشی تێکچوونی عەسەبی بوو(ئەم دۆخە زێدەڕۆییە کە هەستیاربوونی پێوە دیار نەبوو، پیان دەوت: خۆ بە خەمۆك زانین کە هیستریای قەیراناوی لەگەڵ بوو). کریستین کە بە پیشەی مامۆستایەتی سەرماڵانەوە سەرقاڵ بوو، نەیتوانیبوو پەسەندی بکات کە هاوسەرگیری کردووە. دووردەپەرێزیی لە داواکاریی هاوسەرگیری بەردو "دۆخێکی عەسەبی" بردبوو کە "کردەوەو هەڵسوکەوتی سەیروسەمەرەی لەگەڵ بوو". هیگڵ پێشنیاری بە هاوسەرەکەی هیگڵ کردو بووە بەربەست لە بەردەمیدا کە ئەو داواکارییە پەسەند نەکات. لە بری ئەوەدا رۆیشتە لای یەکێك لە خزمەکانو لە لای مایەوە. سەرەتا لەوێ. بە درێژایی رۆژ لەوێ دەمایەوەو دەگریاو دەیقیژاند، بەمشێوە رۆژەکانی تێدەپەڕاند. بەو جۆرەی ئەم خزمەی گێڕاویەتەوە، (کریستین) ناخۆشییەکی زۆری بەرامبەر براکەی دەردەبڕیو رقێکی زۆری بەرامبەر براژنەکەی پیشانددا. وردە وردە دۆخی بەرەو خراپی چوو، تا رادەیەك کە لە نەخۆشخانەیەکی دەروونیدا خەواندیان، بەڵام دوای ساڵێك لەوێ دەربازی بوو.

هیگڵ کە بەردەوام لە سەر خۆ بوو، ئەو لە سەر خۆییەی پاراست، بەڵام ئەم هێما ناسەقامگیرە دەروونیانە لە خوشکەکەیدا، بە دڵنیاییەوە دەبوایە دڵی ئێشاندبێت. بەردەوام بە هۆی ئازاری عەسەبیەوە رەنجی دەچێشت. جارێکیان باسی "رووخان بەردو وڵاتی تاریکی" کرد: "ئەو

شوێنەی کە هیچ شتێکی تەواو، دیار نەبوو- پشتگیری نەبوو. هەموو شوێنێك بریسکەو شکۆداری دەدرەوشایەوە، بەڵام هەموو کات لە پاڵ دیواری مەترسیداری رووخان راوەستا." نهێنیی نەوەی درکاند کە بە شێوەیەك فەلسەفەی ناسیو دەیوت: ***"هەر مرۆڤێك کە خاڵێکی گرنگی وای لە ژیاندا هەبووە، چرکە ساتی گرژبوونو ئاڵۆزاوی سروشتی خۆی "ئەزموون دەکات" کە بە هۆی بەرتەسکیەکانیەوە: ناچارە دڵنیاو بەهێز بێت کە لە خۆیدا هەست بە هێوربوون دەکات، تەنانەت ئەگەر پێشتر نەیتوانی بێت بەرامبەر بەوە لە ناخی خۆیدا رازی بێت."***
پزیشکە دەروونییەکان بۆ چەندین جار جەخت لە سەر "ئارەزووی هێوربوونو پاکبوون دەکەنەوە کە تەنانەت بۆ بیرکردنەوەی بەشێك لە گشت، زۆر ورەبەخشە"- ئاماژەیان کردووە: فەلسەفەی هیگڵ کە سەرچاوەکەی بیرکردنەوەیەکی قووڵە- ئەگەری هەیە لە راستیدا کاردانەوەی پچڕانێکی دەروونی قووڵ بێت لە ناخیدا. بیرۆکەیەکی وا رەنگە گاڵتەئامێز دەربکەوێت، بەڵام بە هۆی تایبەتمەندیی "پچڕانی دەروونی یان سکیزوپید"، لە هەمان کاتدا دەرەنجامی دیالێکتیکی هیگڵ گاڵتەی پێناکرێ کە بە لایەوە هەمان "شێوەی جێبەجێکردنی ژەین"ە.
سەرەڕای هەموو ئەم کێشانە، هاوسەرگیریەکەی هیگڵ بەو جۆرەی باسیان کردووە دڵخۆشیی بە دواوە بووە. دوو کوڕ بە ناوی "ئیمانۆییل"و "کارێڵ"یان بوو. هاوکات لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکانیاندا، "لودویگ" واتە کوڕی سێهەمیان بوو. پاش مردنی دایکی لە شاری "یەنا"، هاتەوە تا لە کۆڕی بنەماڵەییاندا بژیت.

سەرەرای ئەوەی هیگڵ مەبەستێکی باشی هەبوو، بەڵام ئەم دۆخە هیچ سوودێکی بەدواوە نەبوو. رقو کینە وەك مۆریانە چووبووە گیانی هیگڵ. وادیار بوو میراتێکی زۆری لە ژێری باوکی پێنەگەیشتبوو. (لودویك) رێگای بیروڕای باوکی گرتەبەر و بووە خوێندکارێکی توندڕەو. ئارەزووی هەبوو پزیشکی بخوێنێت، بەڵام هیگڵ گوشاری خستە سەر کە بە بازرگانیەوە سەرقاڵ بێت. لودویك ماڵی بەجێهێشتو چووە (لژیۆنی دەرەوەی هۆڵەندا" رۆیشت. پاشان بە کەشتی بەرەو رۆژئاوای هیندووستان رۆیشت (هەمان ئەندۆنیزیا کە لەو سەردەمەدا بندەستی هۆڵەندا بوو)، لەوێ تووشی (تا) بوو گیانی لە دەست دا.

لەو ماوەدا هیگڵ دووهەم بەرهەمی گەورەی خۆی بە ناوی "زانستی لۆژیك"ی چاپو بڵاو کردەوە. ئەم بەرهەمە گەورەیە لەم بوارەوە گرنگو تایبەت بوو کە تیایدا تا رادەیەك هیچ باسی ئەو دوو وشەیەی نەکردبوو کە لە سەر کتێبەکەی دانابوو. هیگڵ وشەی "زانست، متافیزیا، دژەبیرۆکەی فیزیایی" بە کار دەهێناو مەبەستی لە لۆژیك هەمان شێوازی دیالێکتیك بوو. ئەگەر شێوازی دیالێکتیکی هیگڵ لە بری شێوازێکی لۆژیکی پەسەند بکەین، لە راستیدا بیرۆکەکەی، بیرۆکەیەکی گشتگیر- بنەماتر و مەزنتر هەڵدەسنگێنرێت کە تا ئێستا وتراوە، بەڵام ئەگەر شتێکی وا پەسەند نەکات، ئەوسا بە توندی ڕاڕایی دەبێت کە هەموو ئەو سیستەمە بە جۆرێك بەلارێداچوونی فیزیایی دەژمێردرێت. لە سەر بنەمای روانگەیەکی وا، دەبوایە هیگڵ ناوی

"متافیزیـای متافیزیـا" لـه سـەر دابنایـە کـە لـە راسـتیدا باشـتر ناوەڕۆکەکەی دەردەخات.

هیگڵ لە زانستی لۆژیکدا باسی خودی لۆژیك ناکات، بەڵکو لە بری ئەوە ئـەو واتایانـە لێکدەداتـەوە کە ئێمـە لـە کـاتی هەڵسەنگاندنی لۆژیکـدا کەڵکی لێوەر دەگرین، وەك: نووسینەکانی "کانت" کـە باسـی (هـەبوون، رێژە و هەندێ بابەتی لەوشێوە) دەکات. گرنگترین بابەت لـەو نێوانـەدا بە رای هیگڵ، باسی رێژە، یان شرۆڤەیە، کە گشتگیرترین رێـژە بریتیـە لە: نـاکۆکی. لـەمڕووەوە رەوتـی دیـالێکتیکی بیرۆکـە، دژەبیرۆکـەو نـوێ بیرۆکە دەسـت پێـدەکات. هـەر بـەوجۆرەش کـە پێـشتر بینیمـان: هـیگڵ بیرکردنـەوەی بـە راسـتیەکی بنـەمایی دادەنـاو بـڕوای وابـوو چـونکە شێوازی دیالێکتیك لە سەر رەوتی بیرکردنەوە زاڵە، هەر بەو شێوەیەش بـە سـەر راسـتیدا زاڵـە. شـتێکی وا بـە لای هگێڵـەوە "زانـست"ی لۆژیکەکـەی پێکـدێنێت. هـەموو شـتێك پـەیڕەوەی لـە شـێوازی دیالێکتیکەکەی دەکات.

"زانستی لۆژیك" ناکۆکی بنەڕەتی نێوان (کانت)و (هیگڵ) دەدرکێنێت. کانت زانایـەکی خوڵقێنـەرو لـۆژیکزان بـوو، لـەوڕووەوە بـە تـەواوی ئـەو کارامەییـەی هـەبوو کـە کتێبێـك لـە سـەر زانـستو لۆژیـك بنووسێت. بەپێـچەوانەوە هـیگڵ روانگەیـەکی مێـژوویی بەرامبـەر بـە فەلـسەفە هـەبوو. تـەنها رسـتەکانی نیـچە نـین کـە سـەبارەت بـە دەرەنجـامو دەسـکەوتی رووداوەکـان، روانگەیـەکی درێژخایـەنیان هەیـە، هـیگڵ بـە گـشتی جیهـانی بـە دەرەنجـامێکی مێـژوویی دەزانـی کـە بـەردەوام لـە

گەشەکردندایە. بیرۆکەیەکی وا "تایبەتمەندبوونی" ئەو شتانەی کە بە شێوەی کاتی- ن و لەملاو لەولا باس دەکرێت، لەناوی دەبات. هەموو شتێك دەکەوێتە چوارچێوەی ئایندەبینیو رەوتی مێژوویی. کانت لە پێوانەی لەگەڵ هیگڵ دا، وەك پسپۆرێك بە رۆشتبیریو راشکاوانە سەیری جیهانی دەکرد. ئەمرۆکە روانگەی کانت، روانگەیەکی باو و بڵاوە. سەرەڕای ئەمانەش لە بارودۆخێکدا کە مێژووی مرۆڤایەتی بەردو کۆتایی سەدەیەکی درێژخایەنی پەردپێدەرخواز نزیك دەبێتەوە، ئەگەری ئەوە لە ئارادایە بۆ جارێکی تر دیسانەوە روانگەی هیگڵ دەربکەوێت.

هیگڵ بە هۆی کتێبی "زانستی لۆژیك" ناوبانگی دەرکرد. لە حاڵێکدا تەنها بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی بڵاو کردبووەوە. زانکۆکانی "هایدێلبێرگ"و "بەرلین" پێشنیاری مامۆستایەتیان پێدا. هیگڵ، زانکۆی هایدێلبێرگ"ی هەڵبژاردو لە ساڵی (١٨١٦) چووە ئەوێ. بە درێژایی مێژووی ئەو زانکۆیە، هیگڵ بەناوبانگترین فەیلەسوفە. لە سەراولێژیی تەپۆڵکەی ئەوبەری رووبارەکە کە بەردو شار دەچێت، باریکەرێیەك دەبینرێت کە بە "جادەی فەیلەسوف" بەناوبانگە. بۆ گەیشتن بەم باریکەرێیە پێویستە لە ناو باخچە رەزەکانەوە تێپەڕ بینو بڕۆینە سەرەوە. لە خوارەوە پردە کۆنەکەی رووباری "نکار= Neckar"ی ئەڵمانیا لەوێ نووستووە، دوور ماوەیەك لە کەناری دەریاوە، شارێك کە زانکۆوە دێرینەکەی تێدایە، لە خوار قەڵاکەیە. چەندین ساڵ لەوەوپێش کابرایەك پێی وتم بە هۆی نیشتەجێبوونی

هیگڵ لەم شاردا. ناوی "جادەی فەیلەسوف"یان لە سەر ئەو شوێنە داناوە. سەرەڕای ئەمانە پاشان تێگەیشتم ئەم قسەیە راست نیە، چونکە وادیارە هیگڵ حەزی لە پیاسەکردن نەبووە لە دەرەوەی شار.
هیگڵ پاش ساڵێك نیشتەجێبوونی لە هایدێلبێرگ، "زانستنامەی زانستی فەلسەفی لە کۆمەڵەبابەت"ی بڵاو کردەوە. ئەم کتێبە بۆ خوێندکاران نووسرابوو تا پێش ئەوە بەشداری لە وانەکاندا بکەن، ئەم هەلەی بۆ خوێنەر دەرەخساند کە بنەماو رێسا رێزمانیە تەکنیکیەکەی هیگڵ بناسن کە بە چ شێوەیەك کەلکی لە وشە نەناسراوەکان وەرگرتووە. لۆژیك تەنها ئەو واتایە نەبوو کە دەبوایە موار بکرێت: ئێستا وتارەکانی هیگڵ بە گشتی لە تێگەیشتنەوە دوور بوو: تەنها چار نەبوو جیا لەوە دەبوایە لە زمانە ئاڵۆزەکەی تێبگەیشتبای. تەنانەت ساکارترین شرۆڤەش پێویستی بە کردنەوەی نهێنیەکان هەیە: " ئەگەر بە کورتی باسی رەوتی چۆنیەتی بەرەو بەسوودبوونی خوێندنەوە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە دۆخێکی تیایە بۆ دیاریکردنی بنەڕەت، هەبوون و بێ گرێدراوی، کە تیایدا ئاستو دیاریکردن لەگەڵ هەبوونی شتەکان دەبنە یەك، بە شێوازێك کە بە گۆڕینیان، شتەکان هەر خۆیان، خۆیان لە ناو دەبەن." (بە بێ هۆ نەبوو کە رێژەیەك لەو کەسانە کە لە رووداوی شەڕی دووهەمی جیهانیدا هێمای زۆر باشی کێشەی مەتەڵی ئەڵمانی = Germany Enigma"یان درکاند، پێشتر توێژەری فەلسەفەی هیگڵ بوون.

هیگڵ لە زانستنامەی زانستی فەلسەفە لە کۆمەڵەبابەتدا" شرۆڤەی بۆ جۆری سیستمی بیرۆکەکەی کرد. دەتوانین ئەم سیستمە بە کۆمەڵێك لە پێکهاتە هرەمیەکان بژمێرین کە بەردەو سێیانەبوونی والاتر دەڕۆیشت. بیرۆکەی سێیانەی والاتر، بیرۆکەیەکی سەربەخۆیە کە دژەبیرۆکەکەی دەبێتە هۆی دروستبوونی (سروشت)، نوێ بیرۆکەکەشی بریتیە لە ورە، یان راستیەکی سەربەخۆ. دەتوانین گشت ئەو سیستمە بە ورە دابنین کە خۆی راستیەکی تەواوە کە بیر لە خود و ناخو واتای خۆی دەکاتەوە. ئێمە وەك مرۆڤ کاتێك بەرامبەر بە خۆمان بیرمەندتر، یان هوشیارترو ژیرتر دەبین، وردە وردە لەم سیستمەدا رەوتێکی بەرزبوونەوە دەپێوین.

ئەم سیستمە جۆرێك خۆ بە تاقانەزانینی ورەیی شکۆدارە: نوێ بیرۆکەو گشتگیربوونی بیرۆکەی تەواو لەگەڵ سروشتدا واتە ورە، یان راستیەکی سەربەخۆ. سەرەڕای ئەمەش جیا لەوەش شێوەی هرم یان سێ پایەیە. دەتوانین بە دۆخێکی دەورەیی یان زنجیرەیی دایبنین چونکە جیاکردنەوە، یان پەسەندکردنی جیاکردنەوە، لەم کارەدا بنەمای سەرەکییە. شێوازی دیالێکتیك لە هەموو شوێنێکدا جێبەجێکارە: بیرۆکە، دژەبیرۆکەی خۆی پێکدێنێت. راستی، تەنها کاتێك دەناسرێت کە خۆی بە یەکپارچەیی هێشتبێتەوە. واتە خودی دژەبیرۆکەکەی، هەڵەکەی پێکهێنابێتو بە سەریدا زاڵ بووبێت. هەر لەمڕووەوە خوا هەتاهەتاییە کە سنورداربوونی هەتاهەتایی لە خۆ گرتووەو بە سەریدا زاڵ بووە. لە هاتنەخوارەوەی مرۆڤ لە بەهەشتدا

ڕەوتی دیالێکتیکی هاوشێوە دەبینرێت: هاتنەخوارەوە پێویستیەك بوو بۆ ئەوەی مرۆڤ بە شتە باشەکان بگات، جیا لە یەکپارچەبوونی (بیرۆکەو دژەبیرۆکە) لە نوێ بیرۆکەدا، نایەکپارچەبوون یان ناکۆکیی بیرۆکە بوونی هەیە کە دژەبیرۆکەی خۆی پێکدێنێت.

لە ساڵی (١٨١٨) هیگڵ بڕیاری دا کە دژەبیرۆکەی بڕیاری خۆی سەبارەت بە پەسەندکردنی پۆستی خۆی لە زانکۆی هایدێلبێرگ هەڵبژێرێت: ئەوسا پێشنیاری پۆستێکی لە شاری بەرلین هەڵبژارد. هیگڵ لەوێ بووە مامۆستای فەلسەفە، ئەو پۆستە کە دوای مردنی "فیشتە" بە بەتاڵی مابوویەوە. لەم کاتەدا ناپلیۆن دۆڕاندبووی‌و بۆ جارێکی تر دەوڵەتی پرۆس فەرمانڕەوایی ئەڵمانیا گرتە دەست. حکومەت لەم کاتەدا زیاترین دۆخی موحافیزەکاری‌و سەرکوتی تێپەڕ دەکرد، بەرلین پایتەختی ئەو قەیرانە بوو. هیگڵ پاش ئەوە بۆ ماوەی (١٣) ساڵ تەمەنی خۆی بۆ ئەوە تەرخان کرد. وانەوتنەوەکانی بووە هۆی ناوبانگ‌و گشتگیربوونی، بەو شێوە سەرنجی سەدان خوێندکاری بۆ لای خۆی راکێشا، ئەوسا کاریگەری فەلسەفەکەی لە سەرانسەری زانکۆکانی ئەڵمانیادا وردە وردە لە چوارچێوەی "باوەڕ بە هیگڵ" یان "هگێلێزم"دا پەرەی سەند.

لەو کاتەدا هەرجۆرە ئازادیی بیرکردنەوەو دەربڕینی سیاسی لە وڵاتی (پرۆس)دا تا رادەیەك قەدەغە کرابوو. ئەمەش بەو واتایە بوو کە وزەی بیرکردنەوەی خوێندکاران‌و هاوڵاتیانی هەڵکەوتووی بەرلین، بە ناچار دەبوایە شوێنێکی تر بدۆزنەوە تا خۆیان رزگار بکەن.

دەرەنجامی ئەم دۆخە، باوکردنی مەزنی هونەرەکان، فەلسەفەو مۆسیقا لە نێو چینی زۆربلێ و چەنەبازدا بوو.

هیگڵ بە فەرمی بووە فەیلەسوفی حکومەتی پرۆس. لە ساڵی (١٨٢١) کتێبی "فەلسەفەی راستی" بڵاو کردەوە کە سەبارەت بە سیاسەتو مافی کۆمەڵگە باسی دەکرد. هیگڵ بە تەواوی لاینگری دۆخی ئەو کاتی خۆی بوو، بێزار بوو لە هەموو جۆرە بیرکردنەوەیەك لە سەر بنەمایەك کە ئاڵۆگۆڕی رادیکاڵی کۆمەڵایەتی پێوە دیار بوایە. دیالێکتیك بنەمایەی بەرهەمی نوێ بوو بەم شێوە شرۆڤەیە:

***بنیات: یاسا گشتیەکان بە شێوەی هەنگاو بە هەنگاو.***

***یەکسان لەگەڵ بنیاتدا: ویژدانی تاکەکەسی.***

***هاو بنیات: سیستمی کردەوەی کۆمەڵگەیەك.***

هیگڵ بڕوای وابوو کە دەبوایە کۆمەڵگە لە سەر بنەمای خێزانیو کارامەیی بنیات بنرێت. سەرەڕای ئەمەش سەیر لەمەدایە کە شێوازی دەوڵەتی کە لە مێشکیدا پەروەردەی دەکرد، زیاتر هاوشێوەی مۆدێلە بەریتانیەکەی بوو تاکو لە مۆدێلە پرۆس- یەکەی. ئەم دەوڵەتە واتە حکومەتی پەرلەمانیو پاشایەتی بە هێزی سنوردار- دادگایی کردن بە ئامادەبوونی لیژنەی دادوەرو ئاسانکاری وەرگرتن لە بیرۆکەی خەڵکانی تر، بەتایبەتی ئەوانەی بیریان لە ئاین دەکردەوە بەتایبەتی جوولەکەکان. (تا ئەو ئاستەی من ئاگادار بم، هیگڵ خۆی لە دژایەتی بەرامبەر بە کۆمەڵگەی جوولەکە دوور دەخستەوە، لە حاڵێکدا لەو

سـەردەمەدا زۆر بـاو بـوو کەسـانێك یـان هەنـدێ کۆمەلگـە دژایـەتی کۆمەلگەی جوولەکە بکەن).

هیگڵ لەم نێوانەدا درێژەی بە گێژکردنو شلەژاندنی بیرکردنەوەی ئەو خوێندکارانە کرد کە لە هۆڵی وانەکانیاندا هـەوڵی زۆریـان دەدا چونکە هیگڵ لەم بوارەدا زۆر کارامە بـوو. لـە حالێکـدا قـاوخی تووتنەکـەی لـە سەر مێزەکـەی خـۆی دانـابوو، کەللەی کە قـژێکی زۆری پێـوە بـوو بـە سـەر مێزەکـە چـەماندبوویەوە، بـە شـێوەیەکی ناشـیانە یاداشـتەکانی ژێروبان دەکردو سەیریانی دەکردو لە هەمان کاتدا بـە زارێکـی تێکـەڵ بە گومان زنجیرەی بابەتە وەسفیەکانی دەهێنایە سەر زار. بـۆ چـەندین جار کۆکەی لە ناکاو قسەکانی پێدەبڕی. تـا دەرەنجام دۆخێکی تـەنهای لـە خـۆ دەگـرتو هەنـدێجار جۆرێـك خـۆی بـە خـوا زانـین تێکـەڵ بـە شـێوەزار و روون قـسەکردنی چـاوەڕوان نـەکراو بـەرەو لای بیرۆکـەو دژەبیرۆکـە دەچـوو کـە زمـانی تایبـەت بـە فەلـسەفەکەی خـۆی بـوو، دەگەیـشتە ئاسـتێکی والاو بـێ سـنور. ئـەوی بـەرەو سـەرەوە دەبـرد کـە ئەوپەڕی واتاکان بـوو و لەوێـدا گوایـە خـۆ بـە خـوا زانـینی بـە حـەزی خۆی دەکردەوەو دایدەخست تـا جارێکی تـر هـیگڵ کۆکـە لـە سـنگیەوە دەهاتە دەرەوە.

هەنـدێجار روویـدەدا خوێنـدکارێکی زانکـۆ بـە گێـژیو سەرسـوڕمانەوە پـاش وانـەکان بـەرەو مـاڵی هـیگڵ دەچـوو. لـەوێ کەسـێکی نائاسـاییو رەنگ لە روخسار نەماو لە سەر مێزی گەورەی خوێندنەکـە دانیـشتووە لە حالێکدا جلی "رۆب دۆشامبەری" لەبەردایـە کـە رەنگەکـەی "زەردو

خۆڵەمێشی"یەو قوماشی جلەکانی دەوروپشتی خۆی داپۆشیوە. بە شڵەژاوی تۆپەڵە کاغەزو کتێبە پەرش‌وبڵاوەکانی ژێروبان دەکرد. ئەم فەیلەسوفە لە نێو قسەکانی دا لەگەڵ بەرامبەرەکەی کە شڵەژابوو، بۆ ماوەیەك لە ژێر لێوەوە قسەی دەکردو لەبیری دەکرد کە کەسێك لە دەوروبەریدایە.

لەم دەورەیەدا هەندێ نووسینی بە چاپ گەیاند: بەڵام رێژەیەك لە هێمانووسەکانی لاینگری هیگڵ لە پۆلەکەیدا هەندێ یاداشتیان دەنووسی کە لە کۆمەڵە بەرهەمەکانی هیگڵ دا چاپ کراون. ئەم یاداشتە چاپ کراوانە بریتیە لە ئاسانترین شرۆڤەکان کە هیگڵ سەبارەت بە بیرۆکەی خۆی لەبارەی جوانناسی، فەلسەفەی ئاین‌و فەلسەفەی مێژووە بەناوبانگەکەی خۆی هێناویەتە ئارا. هیگڵ لەم یاداشتانەدا هەوڵدەدات مێژوو بە شێوەیەکی دیالێکتیکی بخاتەڕوو: بیرۆکەیەکی دەستکرد کە لە بەرهەمەکانی مارکس دا خۆی دەرخست کە مارکس لاینگری هیگڵ بوو. لە سەر ئەم بنەمایە مێژوو ئاستێکی هەیە کە (ئیرادەی خوا لە روانگەی هیگڵ‌و بەدەستهێنانی دەوڵەتی ئامانجگەرای کومۆنیزمی بە رای مارکس). هیگڵ پێشکەوتنی دیالێکتیکی لە سەر دۆخی دژواری تێگەیشتنی مێژووی لە سەر کۆشکە لیەکانی زەمەن دەدۆزیەوەدو بە دوایدا دەچوو. ئەمپراتۆریەکانی چین، یۆنانی دێرین‌و رۆما دەرەنجام شوێنی خۆیان دەدەنە حکومەتی پرۆس: والاترین شێوازی ژیانی کۆمەلایەتی کە تا ئێستا لە گۆی زەویدا ناسراوە. مێژوو پیشانی داین کاتێك ناوی فەلسەفە لە ولاتانی تر تا

رادەیەك لە ناو چووبوو. فەلسەفە لە پلەی داراییەکی تایبەت بە تاکی دەوڵەتی ئەڵمانیا درێژەی بە ژیانی خۆی دەدا. ئەم ئەرکە شکۆدارەی لە ئەستۆی ئێمە دانا کە پارێزەری ئەم ئاگرە پیرۆزە بین- بەوجۆرە کە لە رۆژگارانی سەرەتاییدا ورەی جیهان، والاترین خۆهوشیاری لە لای نەتەوەی جوولەکە هەبوو. هیگڵ بڕوای وانەبوو کە سەرەتایی ترین پارێزدرانی ئاگری پیرۆزی والای خۆهوشیاری، دەبوایە بەرەو قەیرانێك بڕۆیشتبا کە نازیەکان لە سەدەی بیستەمدا ئەمی تووش کردبوو. ئەگەر هیگڵ زیندوو بمایە لە هیتلەر و کارە نامرۆڤانەییەکانی رایشی سێیەم رقی هەڵدەستایەوە، بەڵام دەبێ بڵێین نووسینی هەڵیت پەڵیتی وا هیچ چارەسەرییەك ناکات.

هیگڵ مێژووی لە کراوەترین دۆخی ئەگەرەکانەوە دەبینی: "دۆخی مێژووی جیهانی". مێژوو لە روانگەی هیگڵ دەرەنجامی (خۆ پەروەردەکردن) یان خۆ زیندووکردنەوەیە (Self- realization).

مرۆڤ بە ئاراستەی وردبینی ژیری‌و خۆناسین دا دەڕوات: ناسینی رۆژ بە دوای رۆژو ئاستی زانینی خود. هیگڵ رایگەیاند کاتێك ئێمە رابردووی خۆپەروەردەییمان لە چاوی گشتاندنێکی واتادارەوە دەبینین، دەبینەوە خاوەن هەموو رابردووی خۆمان. لەمڕووەوە ئامانجی مێژوو تا ئاستی دۆزینەوەی واتای ژیانە.

وێناکردنی هەندێ پێشکەوتن، "تێگەیشتن لە رابردوو" ( گوایە رابردوو تەنها یەك واتای هەیە)، واتای ژیان لەو سەردەم‌و شوێنەدا- واتە ئەڵمانیای سەردتاکانی سەدەی نۆزدەهەم- لەم دۆخەدا ریشەی

داکوتابوو، دووره له راستیەوه که "دۆخێکی مێژووی جیهانی" هەبێت. ویلایەتەکانی ئەڵمانیا لە کاتی یەکێتیدا پێکەوه بۆ پێکهاتنی نەتەوەیەکی بەهێزی ئەوروپی بوونیان هەبوو. شۆڕشی پیشەسازی لە سەرانسەری ئەوروپادا بڵاو بووەوه.

جیهان هەنگاوی نایە ناو دۆزینەوه زانستیەکان، ئەمپراتۆریەکانی ئەوروپا، ناوچه دەسەڵاتەکانی خۆیانیان تا دوورترین شوێنی جیهان بڵاو دەکردەوه. ئەم هەموو دۆخه لەگەڵ دیمەنی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا، جیاوازییەکی زۆری هەیە. ئیتر لەم سەردەمەدا "پێشکەوتن" به شتێکی چاوەڕوان نەکراو نەدەهاته بەرچاو. مرۆڤ بەو ئاسته گەیشتبوو کە رەنگە جۆری مرۆڤ لە سەر زەوی نەمێنێت. هەروەها زانسته تایبەتمەندییو هێڵی روخساری تەواوی هگێڵی لە خۆ گرتووە، نەك رۆح. بیرۆکەی هگێڵی مێژوو، نەیدەتوانی لەگەڵ وەها ئاڵوگۆڕێك دا هەڵبکاتو ئەوانە پەسەند بکات. ئەو سیستەمەی کە مێشکی لەوێوه له دایك بوو واته بیرۆکەی مارکسیيەتی مێژوویی- هەر بەو رادەیەش نەیتوانی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا گونجاو بێت کە "لێکداتەپینی چاوەڕوان کراوی سیستمی سەرمایەداری"یەکی کەللەڕەقانە بوو کە روویدەداو ئەوەی پەسەند دەکرد. ئیتر ئێمە مێژوومان به گەلاڵەیەکی واتادارو پێویست ناژمێرین، بەڵکو زیاتر بە تاقیکردنەوەیەکی زانستی دایدەنین کە دەرەنجامەکەی ئێستا زیاتر بەنده به خۆمانو له ئیرادەی خۆماندایه.

سەرەڕای ئەمانەش روانگەی هیگڵ سەبارەت بە مێژوو سەرەڕای هەموو بەهەڵەداچوونەکانی، بە گشتی را و بۆچوونەکانی بێ متمانە ناکات. هیگڵ لە نێو بیرمەدانی سەدەی نۆزدەهەمدا تا رادەیەك تەنها کەسێك بوو کە باوەڕی بە پێشکەوتنی ئەمریکا هێنا کە لە داهاتوودا روویدا. ئەمە هەر ئەو بیرۆکەیەیە کە خۆی ئاشکرا دەکات. مارکس، نیچە، ژۆڵ وێرن‌و هەموو پێشگۆکانی سەدەی نۆزدەهەم لە گرنگترین ئاڵۆگۆڕەکانی سەدەی بیستەم تێنەگەیشتن.

هیگڵ لە ساڵی (١٨٢٠) بووە بەڕێوبەری زانکۆی بەرلین‌و پاش ساڵێك (فردریك ویلیامی سێیەم)ی پاشا، مەدالیای شانازی پێبەخشی، بەلام لەوە بەدواوە قۆشمەچیەتی جیهان‌و کارە سەیروسەمەرەکانی جیهان دەستیان دابوویە ئازاردانی هیگڵ: لە ساڵی (١٨٣٠) شۆڕشێکی تر لە پاریس روویدا. ئەمجارەیان هیگڵ نەچووە نێو بازاری شار تا جارێکی تر "داری ئازادی" بنێژێت. کاتێك شەپۆلێك لەم شۆڕشە گەیشتە بەرلین‌و بووە هۆی رووداوێکی نائارام لە نێو خەڵکدا، هیگڵ بە هۆی بیرکردنەوەی حکومەتی هەڵبژێردراو لە لایەن خەڵکەوە دۆخی ناخۆش وەرگەڕا. پاش ساڵێك لە "رۆژنامەی دەوڵەتی پرۆس"دا نووسینێکی چاپ کردو تیایدا رەخنەی لە "پرۆژە یاسا" گرت کە لەو کاتەدا لە پەرلەمانی بەریتانیا خەریکی تۆمارکردنی بوون، هەروەها بۆچوونی خۆی سەبارەت بە دیموکراسی بەریتانی راگەیاند. بە بۆچوونی هیگڵ یاسای بنەڕەتی بەریتانیا بە گشتی گۆڕەپانی بشێوە بوو. هیگڵ ئەمەی لە پێوانە لەگەڵ "بیرۆکە ژیرانەکانی" حکومەتی

پـرۆس دا دەیـوت. هـەروەها بـە بۆچـوونی هـیگڵ، حکومـەتی شـەعبی تەنانەت بە شێوەی سنوردارو دوگمائاسـابوونی لـەو سـەردەمەدا کـە لـە بـەریتانیا بـوونی هـەبوو، بەربەسـتێك بـوو بـۆ ئاشـکرابوونی رەقـسی "والـس"ی وردی جیهـانی واتـە (دیـالێکتیکی شـین = The blue Dialectic). تەنانەت نابێ حکومەت رای خەڵك باس بکات. "خـەڵك هەرگیز نازانن چیان دەوێت". سـەرەڕای ئەمـەش تەنانـەت ئـەم قـسانە بۆ کەسانی دەسەڵاتداری حکومەتی پرۆس لە رادەبەدەر شۆڕشیانە بوو، لـەمڕووەوە بەشـی دووهـەمی بابەتەکـەی هـیگڵ کەوتـە بـەر گیـۆتینی سانسۆر.

لە ساڵی (١٨٣١)، شاری بـەرلین تووشـی نەخۆشـی گشتگیری "وەبـا" بـوو کە لە سەرانسەری ئەڵمانیادا قەیراناوی بوو. هیگڵ شاری بەجێهێـشتو بۆ رابواردنی وەرزی هاوینە، لە ناوچەیەك نزیك لە دێهاتێکی سـەر بـە شار نیشتەجێ بوو، بەڵام هیچ شتێك تەنانەت وەبا- ش نەیـدەتوانی لـە هـۆڵی وانەوتنەوەکـەی کـە زۆر بــە لایــەوە خۆشەویـست بـوو دووری بخاتەوە. لە مانگی نۆڤەمبەردا گەڕایەوە بۆ شار و "بـە گـڕوتینو وزەی زۆر بـۆ قـسەکردن، سـەری بیـسەرانی سـوڕماند". یەکـەمین بـەش لـە وانەوتنــەوەکانی دوو رۆژی خایانـد. (رۆزەنکــرانتس، ژیاننامەنووســی هیگڵ، ئەم قسەکردنە باشانەی هگێڵی بـە بۆنـەی هـاتنی وەبـا زانیـوە). رۆژی سێیەم لە بەرامبەر نەخۆشی وەبادا هیلاك داگەڕا، سبەی هـەمان رۆژ واتە لە بەرواری (١٤)ی نۆڤەمبەری (١٨٣١) کاتێك لە خەودا بوو بـە ئارامی گیانی لە دەست دا. لـە حاڵێکـدا هـەرگیز ئاگـای لـەوە نـەبوو کـە

ژیـانی تووشـی مەترسـی بـووە. بـەوجۆرە خـۆی ویـستبووی لـە پـاڵ "فیـشتە" تەرمەکـەیان ناشـت. قەورەکـەی هـیگڵ قەورسـانی "درۆتـێن شتات" لە باکووری ناوەندی شار دەبینـرێت کە گۆڕستانێکی نەتەوەییە. "کرێـستین"ی خوشـکی هـیگڵ لەگـەڵ ئـەوەی هـەواڵی مردنـی بیـست، دەستی کرد بە نووسینی بیرەوەری منداڵیان کە لە لای یەك بـوون. ئـەم بیرەوەریانـەی نـارد بـۆ ژنەکـەی هـیگڵ کـە بیـوەژن مـابووەوە، پاشـان کرێستین خۆی خستە ناو رووبارێك‌و خۆی کوشت.

پاش پێنـج ساڵ، مارکس وەك خوێندکارێکی زانکۆ هاتە شـاری بـەرلین‌و نووسینەکانی هگێڵی ناسی. پاش ئەوەی سەرنجی بیرۆکـەکانی هـیگڵ- ی دا و پاشان بەرامبەر ئەوانە کاردانەوەی دەربڕی، نـوێ بیرۆکـەی خـۆیی بنیـات نـا کـە دەرەنجامی (بیرۆکـەو دژەبیرۆکـە) بـوو، واتـە فەلـسەفەی ماتریـالیزمی دیـالێکتیکی خـۆی بنیـات نـا. ئـەم فەلـسەفەیە بـە هـیچ شـێوەیەك ئـەو شـتە نـەبوو کـە هیگڵ بـۆ ورەی جیهـان لـە بـەر چـاوی گرتبوو.

*پاشکۆی نەوتراو:*

هگێل پێی خۆش بوو زۆر بە باشی سەرنجی بدەن و ئەم ویستەشی سەری گرت. دژەژەهری فەلسەفەی هگێلیزم لە سەرانسەری ئەوروپادا پەرەی سەندو هەموو گروپە فەلسەفەییەکانی ناو زانکۆکانی لە بیرکردنەوەی فەلسەفی پاراست. هگێلیزم لە دۆخی ئەو کات پاڵپشتی دەکرد- هەر ئەو بۆچوونە بوو کە لە ئەڵمانیای سەردەمی ویلیام و بەریتانیای سەردەمی مەلیکە ڤیکتۆریا پێویست بوو. وەها لێکدانەوەیەکی شکۆدار کە تێگەیشتنی دژوار بوو لە دەوڵەتی بورژەوازیدا، بە دڵنیاییەوە دەبوایە دروست بکرایە تەنانەت ئەگەر هیگڵ زەحمەتی ئەو لێکدانەی لە ئەستۆ نەگرتبا هەر دروست دەبوو. فەلسەفەکەی هیگڵ هەموو پێداویستیەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپای دابین کرد. رێكوپێك کردن و بڕوا بە کاری دژوار بە هۆی کارکردنی دژوار، بڕواکردن بە سروشتی پێشکەوتنخواز و بەرەوباشبەری قەیران و رەنج، باوەڕ بە سیستمێکی وردو وردبینانە کە بنیاتە متافیزیاییەکەی لەوپەڕی هەموو شتەکانەوەیە. ئەمانە هەمووی ئەو شتانە بوون کە داوایان لە خوێنەرانی هیگڵ دەکرد (جیا لە توێژی مامناوەندی کۆتایی

سەدەی نۆزدەهەم). سیستمی قوولْو گشتگیری هیگلْ وەك هەندێ یاریی گەورە بوو کە زارەکەی لە شووشەیە: جۆرێك داواکاری بۆ بەرەنگاربوونەوەی بیرکردنەوە کە سەرنجی زۆربەی بیرمەندانی ئەو کاتی بۆ لای خۆی راکێشاو ئەگەری هەبوو هەر بەمشێوە بمێنێتەوە، بەلاّم ئیتر ئەوروپا هەنگاوی بەرەو راوەستانی درێژخایەنی سەدەکانی ناوەڕاست دانەدەنا کە تیایدا دیالێکتیك بۆ پێوانەی لەگەڵ پێوانەی تێگەیشتندا تەنانەت رۆڵێکی گرنگتری لە خۆ دەگرت.

یان رەنگە وانەبووە، شتێکی وا هەر خۆی لە ئارادا هەبووە؟ بە دڵنیاییەوە هەندێ تێکۆشان بە شێوازی جۆراوجۆر، بەلاّم بە دەرەنجامی مەترسیداری هاوشێوەی یەك ئەنجام درا تا سەردەمێکی وا دروست ببێت، سەرەڕای ئەمانەش تاوانی ئەم هەولْدانە مەترسیدار و نەفریناوییە ناگرێ بخرێتە ملی بیرکردنەوەی مامۆستای زانکۆ کە جلی "رۆب دۆشامبەری" بە رەنگی زەردو خۆڵەمێشی لە بەردابوو. رەنگە کارێکی خراپی کردووە کە لە بەرامبەر شێوەزار و زمان دا قەرزار بێت کە بە ئاڵۆزکاوی و پێچوپەنا قسەی کردووە. تێگەیشتنی هیگڵ لە کەون، لە کۆتاییدا جۆرێك دروستکردنی ئەفسانەی ژیرانەی بۆچووندار بوو، بەلاّم ئەوانە تەنانەت بریاریان وانەبوو کە بە دوای تێگەیشتنو لێکدانەوەی جیهانەوە بن، بەڵکو پیان خۆش بوو جیهان بگۆڕن.

هگێلیزم جۆرێك ئەفلاتون گەرایی لە رادە بەدەر دەژمێردرا. ئەفلاتون بڕوای بە بیرۆکەکان یان شتێك جیا لە ماددکان هەبوو کە راستیەکی

بنەمایيە، نەك بەرامبەر بە جيهانی شڵەژاودو سەرنەگرتووی شتەكان كە تيايدا بە سەر دەبەين. ئەو جيهانەی كە لە دەوروبەری خۆمان دەيبينين، تەنها تا رادەيەك راستە كە لەم بيرۆكانە يان ئەوپەڕی ياساكان سوودی هەبێت، بۆ نموونە: تۆپێك كە رەنگی سوورە، بيرۆكەی سووربوون، خڕبوون، تايبەتمەندی وەك سپرينگی هەيە، بەلاّم لە هگێڵيزمدا ئەم ملۆدييە سادەيە لە بيرۆكەكانی ئەفلاتون، گۆڕا بۆ ئۆپێرايەكی هەناسە كپكەر و درێژخايەنی "واگنەر" كە وشەی دژواری لەگەڵ بوو.

رەنگە ئەم هەموو دۆخە فەلسەفييە بەفێرۆدانی كات نەبووبێت. هەندێ سيستمی دێوزمە ئاسا ئەگەری هەيە خۆنەويست بۆ خزمەتی مەبەستێكی مێژوويی بووبێت. كاری سەيرو سەمەری كيميازانەكان بە شێوەيەكی هاوشێوە لەگەڵ متافيزياو بيركردنەوەی جۆراوجۆر تێكەڵ ببوو، بەلاّم ئەمانە بە هەندێ شێواز دەژمێردرێن كە هەندێ بيرۆكەيان بە زيندووی راگرتو پەروەردەيان كرد كە دوايی زانستی كيميايان پێكهێنا. دەرەنجامێك لەمێشوەيە دەتوانين بە باشی لە فەلسەفەی سەدەی نۆزدەهەمدا ببينين. واتە ئەو فەلسەفەيە كە بە سيستمی متافيزيايی شكۆداری بەرزەفڕانەی پرۆسەی ژيری مرۆڤايەتی — واتە دەربڕينی تەواو و رێكوپێكانەی زانستی بە زيندووی راگرتبوو و پەروەردەی كردبوو. كيميازانێكی ژير لە كاتی پێويست دا بە شێوەيەك درێژە بە پرۆسەيەكی وا دەكات كە لە كاتی پشكواندنو پەرەسەندندايە واتە زانستی مۆدێرن لە سەردەمی منداڵی خۆيدا بە

سەری دەبردو بە دەست هەندێ بەرزەفڕی لەمجۆرە بێزار ببوو، بەلام دەرەنجام ئەو شتەی سەرکەوت، بڕواکردنێکی راست بوو. ئێستا لە بری شێوازی دیالێکتیك بۆ نموونە کە (مس) پێوانەی ئاست نزم بۆ (ئالتۆن) دەگۆڕێت. گەیشتووینەتە ئەو ئاستە کە باوەڕمان هێناوە بە لەناوچوونی زانست.

خۆ بەزلزانی هگێلیزم لەمەدا بوو کە دەیویست لە سەر زانست ورد ببێتەوە. بەوجۆرە کە بینیمان شێوازی دیالێکتیك نە مەنتقییەو نەش زانستی، بەلام تەنانەت لەمەش خراپترە، بڕوای هگێلیزم بۆ (کاملبوون) بەندە بە پێکهاتەی زانست. ئەم بیرۆکەیە کە ئەم کاملبوونە تەنها راستیەکی بنیاتیو کۆتاییە، بەلام لە بەر ئەوە بەرەو بیرکردنەوەیەکی مەترسیدار چوو کە جیهانی بەرچاو و ئەو کەسانەی وێنای ئەم جیهانەیان لە بەر چاوە، بەهای نیە. ئەو شتانەی تایبەت بە تاکەکەسییە، بە شێوەی شتێك هاتە ئارا کە " لە راستیدا بوونیان نەبوو". بەلکو تەنها بەشێك بوو لە دەرەنجامێك کە لەوە وەردەگیراو لە سەرووی ئەوە بوو. تاعۆن- ەکانی سەدەی بیستەم، تاعۆنە سیاسیەکان بوونو بڕواهێنان بەم بیرۆکە وێرانکەرانە، (باسیل= ڤایرۆسی درێژماوە)ی ئەم تاعۆنانە بوو.

بنەماییە، نەك بەرامبەر بە جیهانی شڵەژاودو سەرنەگرتووی شتەکان کە تیایدا بە سەر دەبەین. ئەو جیهانەی کە لە دەوروبەری خۆمان دەبیینین، تەنها تا رادەیەك راستە کە لەم بیرۆکانە یان ئەوپەڕی یاساکان سوودی هەبێت، بۆ نموونە: تۆپێك کە رەنگی سوورە، بیرۆکەی سووربوون، خڕبوون، تایبەتمەندی وەك سپرینگی هەیە، بەڵام لە هگێلیزمدا ئەم ملۆدییە سادەیە لە بیرۆکەکانی ئەفلاتون، گۆڕا بۆ ئۆپێرایەکی هەناسە کپکەر و درێژخایەنی "واگنەر" کە وشەی دژواری لەگەڵ بوو.

رەنگە ئەم هەموو دۆخە فەلسەفییە بەفێرۆدانی کات نەبووبێت. هەندێ سیستمی دێوزمە ئاسا ئەگەری هەیە خۆنەویست بۆ خزمەتی مەبەستێکی مێژوویی بووبێت. کاری سەیرو سەمەری کیمیازانەکان بە شێوەیەکی هاوشێوە لەگەڵ متافیزیاو بیرکردنەوەی جۆراوجۆر تێکەڵ ببوو، بەڵام ئەمانە بە هەندێ شێواز دەژمێردرێن کە هەندێ بیرۆکەیان بە زیندووی راگرتو پەروەردەیان کرد کە دوایی زانستی کیمیایان پێکهێنا. دەرەنجامێك لەمێشوەیە دەتوانین بە باشی لە فەلسەفەی سەدەی نۆزدەهەمدا ببینین. واتە ئەو فەلسەفەیە کە بە سیستمی متافیزیایی شکۆداری بەرزەفڕانەی پرۆسەی ژیری مرۆڤایەتی – واتە دەربڕینی تەواو و رێكوپێکانەی زانستی بە زیندووی راگرتبوو و پەروەردەی کردبوو. کیمیازانێکی ژیر لە کاتی پێویست دا بە شێوەیەك درێژە بە پرۆسەیەکی وا دەکات کە لە کاتی پشکواندنو پەرەسەندندایە واتە زانستی مۆدێرن لە سەردەمی منداڵی خۆیدا بە

سەری دەبردو بە دەست هەندێ بەرزەفڕی لەمجۆرە بێزار ببوو، بەلاّم دەرەنجام ئەو شتەی سەرکەوت، بڕواکردنێکی راست بوو. ئێستا لە بری شێوازی دیالێکتیك بۆ نموونە کە (مس) پێوانەی ئاست نزم بۆ (ئالّتۆن) دەگۆڕێت. گەیشتووینەتە ئەو ئاستە کە باوەڕمان هێناوە بە لەناوچوونی زانست.

خۆ بەزلزانی هگێلّیزم لەمەدا بوو کە دەیویست لە سەر زانست ورد ببێتەوە. بەوجۆرە کە بینیمان شێوازی دیالێکتیك نە مەنتقییەو نەش زانستی، بەلاّم تەنانەت لەمەش خراپترە، بڕوای هگێلّیزم بۆ (کاملّبوون) بەندە بە پێکهاتەی زانست. ئەم بیرۆکەیە کە ئەم کاملّبوونە تەنها راستیەکی بنیاتیو کۆتاییە، بەلاّم لە بەر ئەوە بەرەو بیرکردنەوەیەکی مەترسیدار چوو کە جیهانی بەرچاو و ئەو کەسانەی وێنای ئەم جیهانەیان لە بەر چاوە، بەهای نیە. ئەو شتانەی تایبەت بە تاکەکەسییە، بە شێوەی شتێك هاتە ئارا کە " لە راستیدا بوونیان نەبوو". بەلّکو تەنها بەشێك بوو لە دەرەنجامێك کە لەوە وەردەگیراو لە سەرووی ئەوە بوو. تاعۆن- ەکانی سەدەی بیستەم، تاعۆنە سیاسیەکان بوونو بڕواهێنان بەم بیرۆکە وێرانکەرانە، (باسیل= ڤایرۆسی درێژماوە)ی ئەم تاعۆنانە بوو.

***نووسینەکانی هیگڵ:***

ئەو شتانەی ژیرانەیە، راستییەو ئەو شتانەی راستییە، ژیرانەیە.

***فەلسەفەی راستی، پێشەکی***

دەتوانین پیشان بدەین کە واتای فەلسەفە تەنانەت بۆ بیرکردنەوەی رۆژانەمان، ئاگادارییەکی هەیە. ئێمە بە تێگەیشتن‌و حەزە ناگرێدراویەکانمان دەست پێدەکەین، بەڵام ئەم تێگەیشتن‌و ئارەزووانە بە خێرایی لەوپەڕی ناگرێدراوییەوە، لە سەرووی شتێك گەورەتر لە خۆمانەوە بەرەو بوونێکی بێ سنور و ئیرادەی بێ سنورمان دەبات. ئەمەش هەر ئەو رێگایەیە کە من لە "دیاردەناسی ورە"دا بە دوایدا چووم.

***زانستنامەی زانستی فەلسەفە لە کۆمەڵە نووسینەکاندا، ٣***

کات وەك شوێن، یەکێکە لە دۆخە دەگمەنە هەستیارەکان. کات، پێویستییەکی گرنگە بۆ هەر جۆرە هەستێکی چالاكو بێ پەیوەستو هەروەها ئەو شتانەی کە تێدەگەینرێن- واتە مەرجی پێویست بۆ هەر جۆرە ئەزموونو هەر شتێك کە ئەزموون دەکرێت - سروشت لە کاتو شوێن پێکهاتووەو دەرنجامێکە. کاتێك ئاماژە بە لایەنی شوێنگەییەکەی دەکەین، لە تایبەتمەندیی ئامانجدارو بەرچاو تێدەگەین، کاتێك ئاماژە بە لایەنی کاتیەکەی دەکەین، ئاگامان لە دۆخە هوشیارەکەی دەبێت. سروشت بەوشێوە کە لێی تێدەگەین، دەرەنجامی بێکۆتاییو بەردەوامیبوونی گۆڕین- ە. گەندەڵی و خراپی لە هەموو شوێنێکی جیهاندا روودەدا. شتەکان تەنها لە زەمەندا نین بەڵکو پۆلێن کراون. کات بەشێکە لە هەبوون.

## *زانستنامەی زانستی فەلسەفە لە کۆمەڵە نووسینەکاندا، ٢٠١*

هەرجۆرە بیرکردنەوەیەکی لۆژیکی راستەقینە، سێ لایەنی هەیە:

***سەرەتا/ لایەنی تەنهابوون یان شیاوی تێگەیشتن، کە هەبوونی شتێك دەردەخات.***

***دووهەم/ حاشاکردنی دیالێکتیکیەکەی کە ئاشکرا دەکات ئەو شتە چ شتێك نیە.***

***سێیەم/ لایەنی بیرۆکەییەکەی: لایەنی پێکەوە لکاو، یان راستیە.***

(ئەلف) هەمان ئەو شتەیە کە بوونی نیـە. ئـەم سێ لایەنـە، تـەنها سێ لایەنی لۆژیکی نین، بـەڵکو لـە سـەرووری ئەمەشـەوە رەگـەزی سـەرەکی هەموو شتێکن کـە راسـتیەکی لـۆژیکی هەیـە. ئەوانـە بەشـێکن لـە هـەر واتایـەکی فەلـسەفی. هـەر واتایـەك لۆژیکییـە، کـارێکی تایبەتـە کـە بـە واتایـەکی تـر لـە بەرامبـەری دانـراوەو بـە تێپـەڕبوونی کـات لەگـەڵ دژەبیرۆکـەی خۆیـدا، دەبێتـە شـیاوی تێگەیـشتن. ئەمـە لێکدانـەوەی دیالێکتیکە.

## زانستنامەی زانستی فەلسەفی لە کۆمەڵە نووسینەکاندا، ١٢

هـەموو زانـستێك جیـا لـە فەلـسەفە لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ هەنـدێ مەبەستدایە کە بـوونی ئەوانـە بـە گـرنگ دادەنرێـت. ئـەو شـتانەی کـە هەڵدەسـەنگێنرێن پـێش هەڵـسەنگاندنی زانـستی بـە ئاسـانی بوونیـان پەسەند دەکرێت. هەر بەمجۆرەش راستیو دروستی ئـەم لێکدانەوانـەی کـە بەمـشێوەیە دابـین دەکـرێن، بـە گەڕانـەوە بـۆ مـادەی پێویـست لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکرێت. زانست پێویستی بەوە نیە کە بـۆ دۆخـی بوونی مادە یان هەوێنی خۆی، هۆکار بێنێتەوە. بیرکاری، زانـستی مـاف، پزیشکی، زیندەوەرناسـی، گیاناسـیو ... هتـد، زۆرجـار بـوونی کـەم یـان زۆر، شوێن یان مـاوە، ژمـارە، مـاف، نەخۆشـی، ئاژەڵەکانو رووەکـەکانو ... هتد بە ئەوتۆ وەردەگرن.

بـەڵام دۆخەکـە لـەبارەی فەلـسەفە جیـاوازە. فەلـسەفە بـە گومـانو هۆکارهێنانـەوە دەسـت پێـدەکات: بـە پرسـیارکردن سـەبارەت بـە خـۆی

دەست پێدەکات. مەسەلەو شێوازی فەلسەفە پێش ئەوەی دەست بکەین بە فەلسەفەگەرایی، شیاوی پەسەندکردن نیە. لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەم کارد کارێکە کە فەلسەفە باسی لە سەر دەکات. دژواربوونی زۆری مەسەلەکە سەبارەت بەم دۆخەیە. فەلسەفە لە لایەکەوە پێویستە بە توێژینەوەو هەڵسەنگاندن لەبارەی خۆیەوە دەست پێبکاتو لە لایەکی تر پێویستیی بە گوێرەی جیهان، ببێتە هۆی پەیوەندی. فەلسەفە هەر ئەم یەکپارچەبوونەو یەکێتیی پێویستییە کە کارێکی بێ پەیوەندیو کارێکی پەیوەندیدارە.

## *زانستنامەی زانستی فەلسەفی لە کۆمەڵە نووسینەکاندا، ۱۲،۲*

ئەزموونو مێژوو ئەوەمان فێر دەکات کە نەتەوەکانو حکومەتەکان هەرگیز شتێك لە مێژوو فێر نەبوون، یان بە گوێرەی ئەو شتانەی کە دەیانتوانی لە مێژوو فێری ببن، جێبەجێیان نەکردووە.

## *هەندێ وانە سەبارەت بە فەلسەفەی مێژووی جیهان، پێشەکی*

لەمڕووەوە سەرەتاییترین مەرجی روتینی بۆ بەدەستهێنانی هەر شتێکی مەزن یان ژیرانە، چ لە ژیانو چ لە زانستدا، سەربەخۆبوونە-دوور لە بیرکردنەوەی خەڵکی بە گشتی. بە دڵنیاییەوە رای گشتی، درەنگ یان زوو دەستکەوتێکی وا بە فەرمی دەناسێتو لە کاتی خۆیدا ئەوە بە یەکێك لە پێشداوەریەکانی خۆی دەگۆڕێت.

*فەلسەفەی راستی، ٢١٨*

کۆمەڵگەی مەدەنی بە واتای بەشێك لە گشت بنەماڵە، لە ئەستۆیەتی چاودێری پەروەردەو فێرکاری بکاتو لەوددا کاریگەری هەبێت. چونکە پەروەردەو فێرکاری یارمەتیدەرە بۆ منداڵان تا ببنە بەشێك لە کۆمەڵگە. لەمبارەیەوە مافی کۆمەڵگە زۆر زۆر گرنگترە لە ویستی دڵخوازو گۆڕێنەری باوكو دایکان، بەڵکو ئەگەر ئەم پەروەردەو فێرکارییە نەك لە لایەن باوكو دایکان، بەڵکو لە لایەن کەسانی ترەوە جێبەجێ بکرێت.

*فەلسەفەی راستی، ٢٣٩*

ئێمە خەڵکی ئەڵمانیا، تەنانەت ئەگەر هیگڵ هەرگیز بوونی نەبوایە، کەسایەتیمان هیگڵ ئاسا دەبوو، تا ئەو رادەیە کە بە پێچەوانەی نێشتەجێبووەکانی وڵاتانی دراوسێی دەریای سپی بە شێوەیەکی سروشتی گۆڕینو گۆڕانکاری – لە پێوانە لەگەڵ هەبوون یان بوون- بە واتایەکی قووڵترو بەهادارتر دادەنین. ئێمە دەگمەن بڕوامان بە پاساوهێنانەوە هەیە بۆ واتای هەبوون.

*نیچە، زانستی شادیبەخش، هەڵبژاردەی وتارەکان، ٣٥٧*

بە چ شێوەیەك ناخێکی ئازاد هەرچەند ئەگەر بشێودخواز نەبێت، خۆی لە قەرەی رەنج و ئازارێکی شێود ئەسپانیایی دەدات کە من رۆح دەخەمە چوارچێوەی ئەو شتەوە؟

نامەی (١٦٧) بۆ "فۆن سینکلەر".

*(پێش نووس)، ناوەڕاستی ئۆکتوبەری (١٨١٠)*

مادام فەلسەفە توانای ئەوەی هەیە بێداگر بێت لە سەر ئەوەی کە ئارەزوویەکی ئازادو گرێنەدراو دەبێ ماموستاکەی بە راشکاوی بە هەموو کەسێك رابگەیەنێت کە لە هیچ شوێنێك دا ئەگەری ئەوە لە ئارادا نیە فەلسەفە بەهایەکی وای هەبووبێت، تەنها لەوانەیە بە لای هەندێ کەسەود گرنگ بێت.

*نامە، (١٥٢) بۆ (فان گرمت)، لە نۆرەمبێرگ*

*(١٦)ی دیسەمبەری (١٨٠٩)*

مرۆڤ تەنها لە سنور و چوارچێوەی دەوڵەت دا بوونێکی ژیرانەی هەیە. مەبەستی هەموو پەروەردەو فێرکارییەك ئەوەیە گەرەنتی بداتە تاکەکان کە جارێ بە شێوەی هوشیاری یان کەسێك بمێنێتەوە، یان دەست لەو کارە بەربداتو بوونێکی راستەقینە یان بەرچاو لە دەوڵەت دا هەبووبێت. ئەو گشت بوونی خۆی بە قەرزداری دەوڵەت

دەزانێت. هەرجۆرە بەهایەك و راستیەكی ورەیی یان ناخ كە هەیەتی، تەنها بەهرەو دەرەنجامی دەوڵەتە.

## هەندێ وانە سەبارەت بە فەلسەفەی مێژووی جیهان، پێشەکی

ئێمە باس لە سەر ئەو شتانە دەكەین كە لە مێژوودا هەبوون و ئێستا هەن، بەڵام لە فەلسەفەدا بە پێچەوانەی مێژوو، نەك بەتایبەتی سەبارەت بە رابردوو یان تەنانەت سەبارەت بە داهاتوو، بەڵكو لەبارەی ئەو شتانە كە هەن، هەم لەم كاتەدا- هەم بۆ هەمیشە، واتە پەیوەندی بە ژیرییەوە هەیە.

## هەندێ وانە سەبارەت بە فەلسەفەی مێژووی جیهان، پێشەکی

سیستمی ئەخلاقی كۆمەڵگە، لەو ورەیەدا كە لە ناو چوو، واتە لە تاك دا بەرەو ئامانج و راستییەكانی خۆی رۆیشت. سەرەڕای ئەمەش ئەم ناسنامە تاكەكەسیە، بنەماو گەیشتنێكی جیاوازی بۆ سیستمی ئەخلاق هەیە. دەرەنجامی كلتوور و بڕوای گشتگیری جیهان، واتە كەسێكی سەربەخۆ- لێكدەداتەوەو بە كاملكردنی دەرەنجامی جیابوونەوەو لەگەڵ بەدستهێنانی ئەوپەڕی جیاكردنەوەی بەشەكان، ناخ یان خودی ورە، دەبێتە خاوەن بنەماو ئنجا سەرەتا ئیرادە دەبێتە دۆخێكی گشتی، پاشان دەبێتە هی خۆی. لەم قۆناخەدا دەرەنجام وریابوونەوە بە

شێودیەکی گشتی بووەتە شیاوی ئەو راستیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە، چونکە راستیەکەی هەر ئەم وریابوونەوەیەیە. هەموو جۆرە ناکۆکییەکی نێوان ئەم دوو لایەنە لەناو چووە، سەرەڕای ئەمەش نەك بۆ ئێمەو نەش بە تەواوی بە شێوەی داخراو، بەڵکو لە راستیدا بۆ خودی خۆ وریابوونەوە لەناو چووە. لەمڕووەوە خۆ وریابوونەوە زاڵ بووە بە سەر ئەو ناکۆکییەی کە وریایی ئەوی گەرنتی کردووە. ئەم ناکۆکییە بریتیە لە: بەربەرەکانی نێوان دڵنیابوونەوە، یان بڕوا بە خود، مەبەست، یان بابەتی ئەو مەسەلەیە، بەڵام ئێستا مەبەست یان مەسەلەی وریابوونەوە، دڵنیابوونەوە، یان خۆباوەڕییە کە بریتیە لە وریابوونەوە: رێك بەوجۆرە کە باوەڕەکەی خۆی بە واتای گشتی وشە، ئیتر تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆیی نیەو ئیتر مەرجدارو دیاریکراو نیە، بەڵکو وریابوونەودیەکی تەواوە.

## ***دیاردەناسیی ناخ، VI***

زەین یان ورەی جیهانی، خۆی لە هونەردا بە شێوەی وێنەو وێناکردنو خەیاڵ دەردەخات، لە ئایین دا بە شێوەی هەستو بیرکردنەوە بۆ لێکدانەوەکان دەریدەخاتو لە فەلسەفەدا بە شێوەی ئازادییەکی تەواوی بیرکردنەوە دەردەکەوێت. لە مێژووی جیهاندا، زەینی جیهانی خۆی بە شێوەی چالاکبوونی زەین لە چوارچێوەی هەموو ناوەکیبوونو دەرەکیبوون ئاشکرا دەکات. مێژووی جیهان دادگای دادوەرییە، چونکە لە گشتگیربوونی تەواودا، بەشە لاوەکیەکان واتە شێوەکانی پەرەستش،

کۆمەڵگـــەو بیرکردنـــەوەی نەتـــەوەیی لەگـــەڵ هـــەموو چـــالاکییە جۆراوجۆرەکانی دا تەنها بە شێوەی نموونەیی یان بیرۆکـەیی ئامـادەن‌و جووڵەی زەینی لێرەدا دەرکەوتنێکە بۆ ئەم مەبەستە.

مێژووی جیهان – پەیڕەودانی بـە زۆر، واتـە چارەنووسێکی نادیـار کـە خـۆی بـە شـێوەی پێویـستی جیاکردنـەوەو ژیرانـە پـەرە پێـدەدات، دۆخێکـی وا نیـە. بـە پێـچەوانەوە چـونکە زەیـن یـان نـاخ بـە شـێوەی داپۆشـراو و چـالاك ژیرانەیـە، هـەروەها ژیـری لـە زەینـدا بـە شـێوەی وریابوونەوە بۆ خۆی ئاشکرایە، مێژووی جیهان کامڵبوونێکی پێویستە، کـامڵبوونی پێویـستی ئـازادی زەیـن، قۆنـاخی ژیـری‌و لـەمڕووەوە خـۆ وریایی‌و ئازادی زەین.

مێژووی زەین، چالاکیەتی. زەین بە شێوە گشتیەکەی هەر ئەو شـتەیە کـــە ئـــەنجامی دەدات‌و کارەکەشـــی خـــۆی دەکاتـــە مەســـەلەی خـــۆ وریاییەکـەی. لـە مێـژوودا کـارکردنی زەیـن وەك ئـەرکی خـودی زەیـن، وریایی بە دەست دێنێت‌و زەین خۆی لە لێکدانەوەی خۆی بەرامبەر بە خـۆی تێدەگـەینرێت. ئـەم تێگەیـشتنە، هـەبوون‌و چوارچـێوەکەیەتی. پێگەیـشتنی ئـەم هەسـتانە لـە قۆناخێکـدا حاشـاکردن لـەو قۆناخەیـە، هەروەها لە هەمان کاتدا پەرەپێدانیەتی بۆ قۆناخێکی والاتر.

***<u>فەلسەفەی راستی، بەشی مێژووی جیهان</u>***

لـە بەرهەمـەکانی هـیگڵ دا، هەنـدێ لاپـەڕە هـەن کـە لـە جیهـانی بیرکردنـەوەدا هـەر ئـەو کاریگەریانـە بەجێـدەهێڵن بـەوجۆرەی کـە

هۆنراوەکانی "مالارمە" بە جیهانی هۆنراوەدا بەجێدێڵن. ئەم لاپەڕانە تەنها چەندین هۆکارن بۆ هاندانی خوێنەر و جیاوازییە ناسكو گرنگە سۆزداریەکان. ئەم قسەیە لە بەهاو نرخی ئەوانە کەم ناکاتەوە، رەنگە بەهاو نرخی ئەوانەش زیاتر بکات. سەرەڕای ئەمانە، دەرمانی سڕکەری وتاریو رستەسازی لە دۆخی هیپنۆتیزم دا نابێ لە بری راستیەکان بە سەرماندا زاڵ ببێت.

## ***جیۆڤانی پاپینی، بیستو چوار بیرمەند***

کاتێك "یەسوع- یەکان"و "بلاوکەرەوە ئایینیەکانی کاسۆلیك بۆ جاری یەکەم دەستیان بە چالاکی کرد تا کلتۆر و دابو نەریتی ئەورووپی فێری هیندووە سوورپێستەکان بکەن، رۆیشتنە ناو تایفەکانو بەرنامەی رۆژانەیان بۆ ئەوانە دانا، گوایە ئەوانە مندالی قوتابخانەن، هەروەها خەلکی ناوچەکە هەرچەند بێکار و بێبار بوایەن، لە سەر کاتی خۆیداو بە گوێرەی رێساکان پەیڕەویان لێدەکرد. بلاوکەرەوە ئایینەکان هەندێ ئەمباریان دروست کردو هیندییە سوورپێستەکانیان فێر کرد بە چ شێوەیەك کەلکی لێوەربگرن تا بتوانن پێداویستیەکانی داهاتوویان دابین بکەن. بلاوکەرەوە ئایینیەکان لەگەڵ ئەو هیندییە سوورپێستانەدا بە شێوەیەك هەڵسوکەوتیان دەکرد گوایە ئەوانە منداڵن، بەم کارەش باشترین شێوازیان بۆ بە شارستانیەت کردنی ئەوانەیان هەڵبژارد. تەنانەت لە بیرمە بلاوکەرەوەیەکی ئایینی خووی

بەوە گرتبوو نیودشەوان زەنگێك لێبدات تا بەم شێودیە ئەرکی ژنو مێردایەتی (کاری سکسی)یان بە بیر بێنێتەوە، چونکە جیا لەوە هەرگیز بە بیریان نەدەهاتەوە ئەو کارە بکەن. لە سەردتادا ئەم رێسایانە کاریگەرییەکی زۆر بەسوودی هەبوو کە هەر ئەو بزواندنەو وریاکردنەوەیە پێداویستیی ئەوان بوو، واتە ئەو پێداویستانە کە پێگەی هەموو جۆرە چالاکییەکی مرۆڤانەیە.

## رۆژژمێری رووداوه گرنگه فەلسەفییەکان

| | |
|---|---|
| سەدەی شەشەمی پێش زایین | دەسپێکی فەلسەفەی رۆژئاوا لە رێگای بیرۆکەکانی (تالیس مەلەتی). |
| کۆتایی سەدەی شەشەمی پ. ز | مردنی فیساغۆرس. |
| (٣٩٩)ی پ. ز | سوقرات لە ئەسینادا سزای مردنی بە سەردا دەسەپێنن. |
| (٣٨٧)ی پ. ز | ئەفلاتون ئەکادیمەکەی خۆی بنیات دەنێت کە بە یەکەم زانکۆ لە جیهاندا دەژمێردرێت. |
| (٣٣٥)ی پ. ز | ئەرەستۆ یەکەم خوێندنگەی (لیسە یۆم)ی لە ئەسینادا بنیات نا کە دەبێتە کێبڕکێی ئاکادیمەکە. |
| (٣٢٤)ی پ. ز | ئەمپەراتۆر کنستانتین- ی ئەمپەراتۆری رۆما گواسترایەوە بۆ شاری بیزانس. |
| (٤٠٠)ی ز | سنت ئاگۆستیەن کتێبی "دانپیادانانەکان"ی خۆی دەنووسێت. فەلسەفە لە ئیلاهیاتی مەسیحیدا ئاسان دەکرێتەوە. |
| (٤١٠)ی ز | رووخانی ئەمپەراتۆریای رۆما بە دەستی ویزیگت-ەکانو دەسپێکی سەردەمی تاریکی. |

| | |
|---|---|
| (٥٢٩)ی ز | پشۆی ئەکادیمی ئەسینا بە دەستی ئەمپەراتۆر یۆستینین کە هێمای کۆتایی سەدەی زانایی یۆنانە. |
| (ناوەڕاستی سەدەی سێنزەهەم) | تۆماس ئاکۆیناس شرۆڤەکانی خۆی لە سەر ئەرەستۆ دەنووسێت. سەردەمی فەلسەفەی وانە وتنەوە. |
| (١٤٥٣)ی ز | ڕووخانی بیزانس بە دەستی تورکەکان، کۆتایی سەردەمی ئەمپەراتۆریایی بیزانس. |
| (١٤٩٢)ی ز | کریستۆف کولۆمب بەرەو ئەمریکا دەڕوات. سەردەمی ژیانەوە لە شاری فلۆرانس و زیندووکردنەوەی فێرکارییەکانی تایبەت بە یۆنان. |
| (١٥٤٣)ی ز | کۆپەرنیک کتێبی "سەبارەت بە سوڕی گۆ ئاسمانیەکان"ی بڵا کردەوەو لە بواری بیرکاریەوە سەلماندی کە زەوی بە دەور خۆردا دەگەڕێت. |
| (١٦٣٣)ی ز | کڵێسا گالیلەی ناچار کرد بە فەرمی بیرۆکەی ناوەندگەرایی خۆر ڕەت بکاتەوە. |
| (١٦٤١)ی ز | دکارت، کتێبی "بیرکردنەوەکان"ی خۆی بڵاو کردەوە. دەسپێکی سەردەمی فەلسەفەی مۆدێرن. |
| (١٦٧٧)ی ز | کتێبی "ئەخلاق"ی ئەسپینۆزا پاش مردنی مۆڵەتی چاپی پێدەدرێت. |
| (١٦٨٧)ی ز | نیوتون کتێبی "بنەماکان" بڵاو دەکاتەوەو تیایدا باس لە واتای ڕاکێشان دەکات. |

| | |
|---|---|
| (١٦٨٩)ی ز | لاك، "نامیلکەی سەبارەت بە تێگەیشتنی مرۆڤ"ی بە چاپ گەیاندووە بنەمای ئەزموونەکان بەرەو سنورە نوێیەکان دەبات. |
| (١٧١٦)ی ز | لایبنیتس دەمرێت. |
| (٤٠- ١٧٣٩)ی ز | (هیوّم نامیلکەی سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ" بڵاو دەکاتەوەو بنەمای ئەزموون تا ئاستە لۆژکیەکەی بەرەو پێش دەڕوات. |
| (١٧٨١)ی ز | کانت بە هۆی یارمەتی هیوّم لە "خەوی ویستەکانی خۆی رادەچڵەکێت"، کتێبی (رەخنەی رەسەنی دەگمەن) بڵاو دەکاتەوە، سەردەمی شتۆداری متافیزیای ئەڵمانیا دەست پێدەکات. |
| (١٨٠٧)ی ز | هیگڵ کتێبی "دیاردەناسی ورە" بڵاو دەکاتەود کە لوتکەی متافیزیای ئەڵمانیایە. |
| (١٨١٨)ی ز | شۆپێنهاوێر کتێبی "جیهان وەك ئیرادەو پەرچدانەوە" بڵاو دەکاتەوەو فەلسەفەی هیندووستان لە متافیزیای ئەڵمانیا دەخاتەڕوو. نیچە بە راگەیاندنی ئەم بابەتە کە "خوا مردووە"، لە شاری تورێنتۆ تووشی کێشەی دەروونی دەبێت. |
| (١٩٢١)ی ز | ویتگەنیشتاین "نامیلکەی لۆژیکی- فەلسەفیە"کەی خۆی بڵاو دەکاتەوەو پێی وایە کە لوتکەی چارەسەری مەسەلە فەلسەفیەکان بە دەست دێنێت. |

| | |
|---|---|
| دەیەی (١٩٢٠)ی ز | ئەلقەی ڤییەننا، پەرە بە پۆزیتیڤیزمی لۆژیکی دەدات. |
| (١٩٢٧)ی ز | هایدگەر کتێبی "هەبوون‌و کات" چاپ دەکات کە باس لە جیایی نێوان فەلسەفە شیکاری‌و فەلسەفەی ئەوروپی دەکات. |
| (١٩٤٣)ی ز | سارت بە بڵاوکردنەوەی کتێبی "هەبوون‌و نەبوون"، بیرۆکەکانی هایدگەر کامڵ دەکات‌و فەلسەفەی ئەگزیستانسیالیزم گەڵاڵە دەکات. |
| (١٩٥٣)ی ز | بڵاوکردنەوەی "لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکان"ی ویتگەنیشتاین پاش مردنی خۆی. لوتکەی سەردەمی شیکردنەوەی زمان. |

## *رۆژژمێری ژیانی هیگڵ*

| ساڵ | رووداو |
| --- | --- |
| ١٧٧٠ | رۆژی (٢٧)ی جۆن لە شاری ئەشتوتگارت – ی ئەڵمانیا لە دایك بوو. |
| ١٧٨١ | تووشی (تا)یەکی توند دەبێت کە هەموو ئەندامانی خێزانەکەی تووش دەکاتو دەبێتە هۆی مردنی دایکی. |
| ١٧٨٨ | لە زانکۆی تۆبینگەن خوێندنەوە لە سەر یەزدانناسی دەکاتو لەوێدا لەگەڵ "هولدەرلین"و (شلینگ) یەکتر دەناسن. |
| ١٧٩٣ | پاش تەواوبوونی وانەکانی لە زانکۆی تۆبینگەن، بەرەو شاری "بێرن"ی سویسرا دەڕوات تا وەك مامۆستای ماڵان سەرقاڵی وانەوتنەوە ببێت. |
| ١٧٩٦ | "هولدەرلین" لە فرانکفۆرت هەوڵی بوو دەدات پیشەی مامۆستای ماڵانی بۆ رێك بخات. |
| ١٧٩٩ | هیگڵ باوکی دەمرێتو بە داراییەکی کەم بەجێدەهێڵێتو میراتێکی زۆر کەمی بەر دەکەوێت. |
| ١٨٠١ | بە پاڵپشتی (شلینگ) لە زانکۆی (یەنا) دەگاتە پلەی یاریدەدەری مامۆستایەتی. |

| | |
|---|---|
| ١٨٠٦ | هیگڵ هەر لەو کاتەدا کە ناپلیۆن لە شەڕی یەنا سەردەکەوێت، نووسینی کتێبی "دیاردەناسیی ورە"تەواو دەکات. |
| ١٨٠٧ | دەبێتە خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەی بامبۆرگەر سایتۆنگ. |
| ١٨٠٨ | دەبێتە بەڕێوبەری خوێندنگەی ئامادەیی لە نۆرەمبێرگ. |
| ١٨١١ | لەگەڵ "ماری فۆن تۆشەر"دا هاوسەرگیری دەکات. |
| ١٨١٢ | بەشی یەکەمی "زانستی لۆژیك" بڵاو دەکاتەوە. ئەم کتێبە پاش چوار ساڵ بە تەواوی کامڵ بوو. |
| ١٨١٧ | (زانستنانەی زانستی فەلسەفە بە کۆمەڵەی بابەتەکانیەوە) بڵاو دەکاتەوە. |
| ١٨١٨ | دەبێتە مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی بەرلین. |
| ١٨٢١ | فەلسەفەی راستی بڵاو دەکاتەوە. |
| ١٨٣٠ | لەو شۆڕشانەی کە لە بەرلین دا روودەدات، پەشۆکاوی دایدەگرێت. دەبێتە بەڕێوەبەری زانکۆی بەرلین. |
| ١٨٣١ | لە (١٤) نۆڤەمبەردا بە هۆی نەخۆشی وەبا لە شاری بەرلین گیانی لە دەست دەدات. |

## رۆژژمێری سەردەمی هیگل

| ساڵ | ڕووداوەکان |
|---|---|
| ١٧٧٠ | لە دایکبوونی "هولدەرلین"، (بتهۆوێن)و (وردزۆرس). |
| ١٧٧٦ | وڵاتانی ئەمریکی ژێر دەستی بەرتانیای گەورە، سەربەخۆیی خۆیان بە دەست دێنن. دەرکەوتنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. |
| ١٧٨٦ | مردنی فردریکی گەورە. |
| ١٧٨٩ | شۆڕشی فەرەنسا. |
| ١٧٩٣ | شۆڕشی فەرەنسا لە سەردەمی (رۆبسپیر)دا دەگۆڕێت بۆ حکومەتێکی تۆقێنەرو مەترسیدار. |
| ١٨٠٦ | ناپلیۆن لە شەڕی (یەنا)دا سەردەکەوێت. |
| ١٨١٣ | لەدایکبوونی واگنەر. |
| ١٨١٣ | ناپلیۆن لە شەڕی (واتەرلۆ)دا تووشی شکست دەبێتو بە دوای ئەوەشدا بەرەو دوورگەی (سنت هێلین) دەخرێتە تاراوگە. بەرتانیا ئەمپەراتۆریای خۆی لە سەرانسەری هیندووستان دا دەسەپێنێت. |
| ١٨١٩ | (سیمۆن بۆلیوار) شەڕو شۆڕشەکەی بۆ ئازادکردنی |

| | |
|---|---|
| | ئـــەمریکای باشـــووری لـــە ژێـــر دەســـتی حکومـــەتی سەپێنەری ئەسپانیا دەست پێدەکات. |
| ١٨٢١ | (فارادی)، یاسای دایناموی ئەلێکتریکی دەدۆزێتەوە. |
| ١٨٢٥ | داهێنـــانی هێڵـــی شـــەمەنەفەر. هێڵـــی شـــەمەنەفەری (ســـتاکتۆن) بـــۆ (دارلینگتـــۆن) لـــە لایـــەن (ستیۆنـــسۆن) دەکرێتەوە، (ستیۆنسۆن) دۆزەرەوەی لوکوموتیو- ە. |
| ١٨٢٩ | بەریتانیا هەموو دوورگەکانی ئوسترالیا داگیر دەکات. |
| ١٨٣٠ | یۆنـان لـە ژێـر دەسـتی ئەمپـەراتۆریای عوسمـانی جیـا دەبێتەوەو سەربەخۆیی خۆی رادەگەیەنێت. |
| ١٨٣١ | (دارویـن) بـە کەشـتییەکی بـەریتانی بـە نـاوی (بـیگڵ) گەشـــتە دەریاییـــەکانی خـــۆی بـــەرەو دوورگـــەکانی (گالاپاگۆس) دەست پێدەکات. |
| ١٨٣٢ | مردنی گوتە لە (وایمار). |

زنجیرە کتێبی
ناسینی فەیلەسوفەکان

نیچە
سوقرات
ئەرستۆ
ئەفلاتوون
ئیسپینۆزا
ئاکویناس
ئاگوستین قەدیس
دیکارت
سارتەر
کیرکگۆر
ئەینشتاین
هیگڵ
هیوم
ماکیاڤیلی
لایبنیتس
لاک

## زنجیرە ناسینی فەیلەسوفەکان

ناسینی فەیلەسوفەکان زنجیرەیەکە لە ژیانی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانو دەرگایەکی کراوەیە بۆ ناسینی بیروڕاو روانگەکانیان. لە هەر کتێبێك لەم زنجیرەیەدا جیا لە خستەڕووی زانیاری سەبارەت بە ژیانی فەیلەسوفەکان، بیرو بۆچوونی هەر فەیلەسوفێك لە پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەدا دەوترێتەوەو هاو ئاراستەیە لەگەڵ رووداو و گۆڕانکارییە هزریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی سەردەمی خۆیاندا. گرنگترین بیری فەیلەسوفەکان بە زمانێکی سادەو روون باس کراوە لە هەمان کاتیشدا لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی فەلسەفی وەرگیراوەو وردبینیەکی باشی لە سەر بووە. تازەپێگەیشتوانو گەنجانو هەموو خوێنەران کە فەلسەفەیان بەلاوە چێژبەخشە ئەم کتێبانە دەتوانێ هاوڕێو یازمەتیدەرێکی باش بێت بۆ جۆری بیرکردنەوەکانی. رەنگە ببێتە دەسپێکێك بۆ ئاڵوگۆڕ لە ژیاندا.




# کۆشـــك
## فرانتس کافکا
## بەم زوانە...

سایە